# دەستی پەروەردگار

(٣)

حبیب محمد سعید

چاپخانەی ( الارشاد ) لە بەغدا
سالی ١٤٠٦ی کۆچی

# پێشەکیی

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد الاولين والآخرين وعلى آله وصحبه اجمعين ..**

خوای گەورە راستیی و پاکیی ئەوێ ، بۆیە ئایینی پیرۆزی کە ناردووە بۆ گەیاندنی ئەم مەبەستە بەرزەیە : راستکردنەوەی بیروهەستی ئادەمیزاد و پاککردنەوەی دڵ لە هێشەکی تابتوانێ و بزانێ بە تەواوەتیی و رێك و پێکیی خوای پەروەردگار بپەرستێ ..

ئەوانەی بە راستیی و بە پاکیی خوا ئەپەرستن ، ئەوانە دەستی خوایان لەگەڵە .. خوا کۆمەك و پشتیوانیانە .. بەڵام ئەوانەی لا ئەدەن و لە فەرمانەکانی ئایینی ئیسلام یاخیی ئەبن ، بە مسۆگەریی تۆڵەیان لێ ئەسەنرێ و ئەبنە پەند بۆ کەسانی تر ، ئیتر زوو بێت یا درەنگ ..

نامیلکەی ئەمجارەمان لە چوار چیرۆك پێك هاتووە

و لـه سەرچاوەی چیرۆکەکانی ترەوە بە دەستکاریەوە وەر گیراون جگە لە چوارەمیان کە لە گۆفاری « التربیة الاسلامیة » ژمارە/٥ ی ساڵی/١١ وەرگیراوە ٠٠

داواکارین لـه خـوای گەورە یارمەتیی کۆمەڵی ئیماندار بدات تـا بە ریك و پیکیی فەرمانەکانی جـێ بەجێ بکات و سەربەرزی دنیاو قیامەتبێت ٠٠

( ١ )

هەر تەنها ئامۆژگاریەکانی ئیسلامن وا لە مرۆڤ ئەکەن خۆی و کۆمەڵەکەی پاك راگیر کات .. هەروەك حەزی لە شەرەف و ناموسیەی پارێزراو بێت ، وەهایش حەز بکا شەرەف و ناموسی خەڵکیی تر بپارێزێت .. ئەمە سروشتی ئادەمیزادە ، ئەگەر رە بەرەڵلایی و بێ ئابڕوویی گۆش نەکرێ و بە شەزوالپیسیی بەنج نەکرێ ، ئەوا یەکەم ئاواتی ژیانی پاراستنی شەرەف و ئابڕووە .. ئەو تاجەی شانازیی پێوە بکات بیخاتە سەر سەری تاجی حەیایە .. خوای گەورەش بۆ ئەمە یاسایەکی جوانی نەخشە کێشاوە .. یاسای « تۆڵە بە وێنە » .. ئەمەش ئەوپەڕی داد پەروەریە .. چونکە دەستدرێژیی شەرەف کارێکی زۆر قێزسە و بەهیچی تر ناگۆڕرێتەوە .. تا هەرکەس حەزی لە شەرەفی خۆیەتی ، شەرەفی خەڵکیی بپارێزێ .. وە ئەوەش جڵەوی بەرەڵایی و بێ

ئابڕووی خۆی شل ئەکا بە هەمان شێوە تۆڵەی لێ بکرێتەوە ..

بازرگانێکی گەورە بوو .. لە نێوان عیراق و سووریە دا بازرگانیی ئەکرد .. لەعیراقەوە دانەوێڵەی ئەبرد بۆ سووریە و ئەیفرۆشت و لەوێشەوە صابوون و قوماشی ئەهێنا بۆ عیراق .. ئەمە پێش جەنگی جیهانیی یەکەم بوو کە هێشتا شەمەندەفەر و ئوتومبێل لە وڵاتی رۆژهەڵاتا نەکەوتبوونە کار ..

لە راستیدا پیاوێکی رەوشتبەرزی موسڵمانی خواناس بوو .. رەفتاری رۆژانەی رەفتاری موسڵمانێکی دەوڵەمەند بوو و سامانی ئەم جیهانەی کردبووە پرد بۆ رۆژی قیامەت . وە هەموو ساڵێک زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەر ئەکرد و بە شێوەیەکی شەرعیی ئەیبەخشییەوە . لەو خێر و بێرەی خوا رژاندبووی بە سەریا بەشی هەژاران و بێنەوایانی ئەدا .. پێویستیی خەڵکیی جێبەجێ ئەکرد .. هەتا لە توانایا بوایە

کەسی جواب نەئەکرد .. دلی کەسی نەئەشکاند ..
بە دەروونێکی فراوانەوە ئەیوت :

« زەکاتی سامان لە سامان ئەدرێت و زەکاتی پایە و مەقامیش بە جێبەجێکردنی پێویستیی خەلکیی » .

ئەو گەڕەکەی ئەو تیایا ئەژیا دلیان زۆر پێی ئەکرایەوە .. چونکە بە راسیی نموونەی موسلمان بوو .. هەرکەسێ لە گەڕەکەکەیا نەخۆش بوایە ، بۆی بکرایە هەموو رۆژێ سەری لێ ئەدا .. لەنزیك مالەکەیدا مزگەوتێکی بچووك هەبوو کە نوێژی شێوان و خەوتنانی بە جەماعەت تیا ئەکرد .. هەر دراوسێیەکی لە نوێژ دوا بکەوتایە ، خێرا هەوالی ئەپرسیی ، خۆ ئەگەر هۆی دواکەوتنەکەی نەخۆشیی بوایە سەری لێ ئەدا و دلخۆشیی ئەدایەوە و پێویستیی جێبەجێ ئەکرد .. وە ئەگەر پارەی پێویست بوایە ، دەستی یارمەتیی بۆ درێژ ئەکرد ، وە ئەگەر لە سەفەر بوایە ، سەروکاریی مال و منالەکەی ئەکرد هەتا ئەگەڕایەوە ..

ئیسلام زۆر بەرزە .. بە راستیی پیاو دروست

ئەکات •• ئەوانەی بە دڵ لێ نەبڕین بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ، ئەبنە مرۆڤێك هەموو کەسێك ـ چ موسڵمان و چ ناموسڵمان ـ شانازیيان پێوە بکات •• بە راستیی ئەبنە ئەستێرەیەکی گەشی پرشنگدار لە ئاسۆی بەختیاریدا ••

ئەم پیاوە موسڵمانە کوڕ و کچێکی هەبوو کە هەردووکیان گەیشتبوونە تەمەنی لاوی ••

رۆژێك لە رۆژان ، باوکەکە بانگی کردە کوڕە تاقانەکەی و فەرمانی بە سەردا تا سەروکاریی کاروانی بازرگانییەکەی بگرێتە ئەستۆ و پێی وت :

«کوڕەکەم ، وا من چووم بە سالاّ و توانای سەفەرم نەماوە • تۆیش وا ـ سوپاس بۆ خوا ـ پیاوێکیت بە پشتیوانیی خـوا لەگەڵ کاروانی دانەوێڵەکەدا بچۆ بۆ حەڵەب و هەرچی ئەبەی لەوێ بیفرۆشە و بە نرخەکەی سابوون و قوماش بکڕە و بگەڕێرەوە دوا••ئامۆژگاریت ئەکەم ترسی خوات لە دڵا بێت ، وە داوات لێ ئەکەم شەرەف و ئابڕووی خوشکەکەت بپارێزیت » ••

بە فەرمانی پیاوی موسڵمان کوڕەکەی خـــۆی ئامادەی کەشتی بازرگانیی کرد .. هەنگاو بـە هەنگاو و مەنزڵ بـە مەنزڵ سەروکاریی کاروانی ئەکـرد .. پارێزاریی ماڵ و سامانـەکەی ئـەکرد .. پێویستیی پیاوانی کاروانەکەی جێ بەجێ ئەکرد .. تـا ئەوە بوو بە کۆمەکیی و پشتیوانیی خوا گەیشتنە شاری حەڵەب..

لـەوێ دانەوێڵـەی فرۆشـت و بـە نرخـەکەی صـابوون و قوماشی حەڵـەبی کڕی کـە هـەردووکیان نموونەی کاری رێك و پێکیپیشەسازیی موسڵمانـانـە بوون .. ئەوسا کەل و پەلی پێچایەوە و خۆی ئامادە کرد بـەرەو مووسڵ بگەڕێتـەوە .

رۆژێـك لـە رۆژان ، هێشـتا حـەڵـەبی بـە جێ نەهێشتبوو ، لە رێگایەکی چۆڵ و دوای خـۆراوا بوون چاوی کەوت بـە کچێکی گەنجی جوان .. لەبەر چاویا زۆر شەنگ و شۆخ بوو .. شەیتان دڵی راکێشا

بۆ لای کچە و دەروونی ستەمکاریش مێشك و ژیریـنی لـە خشتە برد و هاتە سەر ئـەو رایەی لـەم چۆڵی و نا یارییەدا ، کچەکە ماچ کات .. چاودێریی خـوای لەبیر چۆوە .. ئامۆژکارییەکەی باوکی خستە پشـت گوێ .. هەوای گەنجێتیی کەوتە کەللەی و بـە بـێ ورتـە و پرس و را هەڵمەتی دایە کچە و ماچی کرد .. هـەر ئەوەندە ..

کوڕەکە لەگەڵ ئەم جۆرە رەفتانەدا را نەهاتبوو ، بۆیە خێرا شەرم گرتی و رای کرد و کچەش کـە بـە تەمای ئەم دەست درێژییە نەبوو ئەویش رای کـرد .. رای کرد و خۆی دوور خستەوە بـا هەر ئەوەندەی بـە سەرا هاتبێ نەوەکو کوڕەکە خیاڵی خراپتر بکات ..

کوڕە پەشیمان بۆوە : ئۆخەی کەس بـە چاوەوە نەبوو .. پێیان بزانیمایە ئابڕووم ئەچوو ..

گەڕایەوە شوێنی مانەوە و حەسانەوەی لە حەڵەب .. پەشیمانیی سەری تێ کـرد .. کـەوتـە لـۆمەی دەروونی لار و وێر .. بەڵام لۆمەو پەشیمانیی چ دادێك

ئەدەن ؟ تازە لە دەستی دەرچوو ..

هاوەڵانی سەفەری بەم راز و نیازەیان نەزانی ..
نەك ئەوان هەر هیچ کەس نەیزانی .. خۆیشی بە لای
کەسەوە نەیدرکاند .. ئیتر ئەوە بوو دوای چەند
رۆژێك کەوتە رێ و بەرە و شارەکەی خۆی
گەڕایەوە ..

لە کاتێکا کوڕە وا لە گەشتی بازرگانییدا و ئەو
پەنەی هات بەسەرا ، باوکی لەماڵەوە بوو ..
رۆژێکیان باوکەکە لە ژوورەکەی خۆیا دانیشبوو
و پەنجەرەی ژوورەکەشی ئەینواڕییە حەوشەی
ماڵەکەیان ، ئاوکێشەکەیان تەقەی دا لە دەرگا و
کچەکەی بە پەلە رای کرد و دەرگای بۆ کردەوە ..
ئاوکێش هاتە ژوورەوە و دەمی کوندەکەی کۆڵی خستە
سەر دەمی کووپەی ئاوەکە و ئاوەکەی کردە ناوی ،
کچەش لە تەنیشت دەرگاوە چاوەڕوان بوو ئاوکێشەکە
کوندەکەی خاڵی بکاتەوە و ـ وەك رۆژانی تر ـ دوای
چوونە دەرەوەی لە حەوشە دەرگاکە داخاتەوە ..

ئاوكێش كوندەی خاڵی كردەوە و بە خاڵیی دای بە ئانیا و كاتێ گەیشتە لای كچە هەڵمەتی دا و ماچێكی كرد .. خێرا بە پەلە سەری خۆی هەڵ گرت و بە بێ ئاوڕدانەوەماڵەكەی بەجێهێشت !

كچە زۆر بە لایەوە سەیر بوو .. باوكەكەشی لە پەنجەرەكەوە بە چاوەوە بوو ، هەر ئەوەندەی پێ كرا بەوپەڕی داخ و خەفەتەوە هەناسەیەك هەڵ كێشێت و خۆی بداتە دەست پەروەردگار و بڵێ :

« لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم » .

هیچ دەنگی نەكرد .. كچەكەشی لە بەر شەرمەزاریی خۆی و هیچ كات شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو ، ئەویش دەنگی نەكرد ..

بۆ رۆژی دووەم ئاوكێش كوندەی پڕ كردەوە لە ئاو و هاتەوە بۆ ماڵی پیاوەكە .. وەك جاران نەبوو .. سەری خەجاڵەتیی شۆڕ كرد بوو .. شەرمەزار بوو .. تەریقی حاڵی دوێنێی ئەبۆوە .. كچەكە دەرگاكەی

بۆ کردەوە ، بەڵام ئەمڕۆ وەك دوێنێ نەبوو ..
بە هیچ شێوەیەك نەچووەوە بەلای ئیشەکەی دوێنێیەوە..
ئەو پیاوە ئاوکێشمە کاری ڕۆژ و دوو ڕۆژی
نەبوو .. چەندەها ساڵ بوو ئاوکێش بوو .. نەك هی
ئەو ماڵە بە تەنیا ، بەڵکو هی گەڕەکەکە هەمووی .. وە
ڕۆژێ لە ڕۆژان جێگای گومان نەبووە و هیچ جۆرە
هەڵوێستێکی نەشیاوی پێوە نەبینرابوو ، هەتا بە حەرامی
چاوی نەئەخست بۆ ناموسی خەڵکی .. تەمەنیشی لە
نێوان چل و پەنجا ساڵیدا بوو و تەمەنی گەنجێتیی و
هەرزەکاریی و سەرکەشیی و فیز و نازی بە سەر
بردبوو .. بە هیچ شێوەیەك پیاوی ئەو رەفتە نەبوو ، وا
لە دەستی دەرچوو ..

## ( ٣ )

کاروانی بازرگانیی گەیشتە بەرەوە .. کوڕی
سەروکاری کاروان بە لەشی ساغ و دەستهاتێکی
چاکەوە هاتەوە لای باوکی .. لەبەر خۆیەوە هیچی

نەهێنشتۆتەوە •• بە تەمایە باوکی بیخاتە سەرچاوانی ••
بەڵام باوکی بە لەشی ساغی کوڕ و قازانجی زۆری
بازرگانیی دڵی خۆش نەبوو •• هیچ پرسیارێکی لە
بارەی بازرگانیی و قازانج و سەفەر و دۆست و برا و
خۆشەویستانی حەڵەبەوە لێ نەکرد ••

کوڕ بە تەمابوو باوکی ئەمانەی لێ بپرسێ ، کەچی
پێش هەموو شتێ لێی پرسیی :

لەو کاتەوە مووسڵت بەجێ هێشتووە هەتا
گەڕاویتەوە چیت کردووە ؟

کوڕەکەی دەستی کرد بە گێڕانەوەی دەنگ و
باسی بازرگانییەکەی •• بەڵام باوکە بۆ ئەمە پرسیاری
لێ نەئەکرد ، بۆیە ئەو چیرۆك و بەسەرهاتانەی پێ
خۆش نەبوو ئەو بیان گێڕێتەوە ، لە دەمی بڕی و
پرسیی :

«ئایا کچت ماچ کردووە ، کەی ، وە لە کوێ ؟»••

کوڕە سەرسام ما ••

چی لە باوکی ئەبیستێ ؟

ڕەنگی بزرکا ..
خۆ کەس پێی نەزانیوە ..
ئەی چۆن باوکی لە خۆیەوە ئەم پرسیارەی لــێ ئـەکـا ؟
چاوی بڕیبووە بەردەمی و وەك لە ئەندێشەیەکی قووڵــدا بژیت ..
ناچار بوو مل بــا بدات .
دەم و چاوی سوور بوویەوە .
ڕەنگا و ڕەنگ ئەگۆڕا .
باوکیشی بە هێمنییەوە سەرنجی ئەگرێت ..
کوڕە تف لە قوڕگیا وشك بوو بوو ..
زمانی وەرنەئەچەرخا .
پیاو خۆ لــە شەرمەزاریيا ئامرێت .
سەری دا خست .. چاوی زاق و لێوی وشــــك بوو بوون ..
بۆ خۆی بەردێکی ڕەق و تەق بوو ..
جووڵەی لێ بڕڕا بوو ..

مەرگ وا بە ئاسانیی دەست ناکەوێ ، ئەگینا دەرمانی هەندێ هەڵوێستە ..

کوڕە هەر بێدەنگ بوو وە ئەگەرچی ملوەیەکی کەم بوو بەڵام بۆ ئەو مانگ و ساڵ بوو .. هەر نەئەبڕایەوە ..

باوکە شتێکی دەست کەوت .. زیاتر متمانەی بە بۆچوونەکەی خۆی پەیدا کرد ..

بۆیە کۆتایی بە بێدەنگیی و وڕیی کوڕەکەی هێنا و پێی وت :

من ئامۆژگاریم کردی کەوا لەم سەفەرەتدا شەرەف و ئابڕووی خوشکەکەت بپارێزی کەچی وات نەکرد ..

ئینجا دەنگ و باسی خوشکەکەی بۆگێڕایەوە کە چۆن ئاوکێشی متمانەپێکراوی ساڵانەیان ماچی کردووە .. دیارە ئەم ماچکردنە لە جیاتی ئەو ماچە حەرامە بووە و قەرزەکەی پێ دراوەتەوە ..

کوڕە چاری نەما ..

لـە بەردەم راسیەکانی باوکیا دانی نـا بـە هەموو راسـتیەکا ..

کاتـێ کـوڕە دانی بـە راسـتیی رووداودا نـاو بـەسـەرهاتی خۆی بۆگێڕایەوە ، باوکە دڵی پڕ بوو و بەئاسەیەکەوە کە بـەزەیی بە خـۆی و کوڕەکـەی و کچەکەیـا ئەهاتەوە و دڵی لەخۆی دا ئەما وتی :

« مـن چاك ئەزانم خـۆم نەتـلاندووە بـە هیچ حەرامێکەوە ، وە پارێزگاریی شەرەف و ئابڕووی خۆمم کردووە لـە کاتێکا کە پارێزگاریی شەرەف و ئابڕووی خەڵـکم ئەکرد .. وە شك نابـەم و بـە بیرما نایـەت ناپاکیەکم لە نامووسی کـەسـا کردبێ وە یا شـەرواڵ پیسیەکم کردبێت ، بۆیە تکام وایە لـەو بـارەوە هیچ لەرزێکم بە سەرەوە نـەبێت .. وە کاتێ ئاوکێشـەکە خوشکەکەتی ماچ کرد ، بە لامەوە روون و ئاشکرا بوو تۆش ئافرەتێکت مـاچ کـردووە و وا خوشـکەکـەت لەرزەکەی دایەوە..هـەق بـە هـەق ، ئەگەر زیاترت بکردایە ئاوکێشەکەش زیاتری ئەکرد .. » .

لەو کاتەدا کۆترێکیش بە سەر بانەکەیانەوە بوو..
بە ۆرانیی وتن و بە دەنگێکی غەمگینەوە خەریکی
دەربڕینی رازی دڵی بوو کە ئەیوت :

هەرکەس لە شەرەفی نەوە و نەوەی نەوەی
ئەترسێ ، یا شەرمی خوا لە دڵیا بێ ..

وە هەرکەس بە شوێن شوورەیی و کەم و کوڕیی
خەڵکا ئەڕا ، خوایش بە شوێن شوورەیی و کەم و
کوڕییەکانی ئەگەڕێ ..

وە هەرکەسێ خوا بە شوێن شوورەیی و کەم و
کوڕییەکانیا گەڕا ، ئابڕووی ئەبات هەرچەندە لە ناو
سکی دایکیا بێت ..

وە هەرکەس حەزی لە پاراستنی ناموسی
خۆیەتی ، با پارێزگاریی لە ناموسی خەڵکیی بکات ..

وە هەرکەس حەز ئەکا ناموسی بشکێت ، با
ناموسی خەڵکیی بشکێنێ ..

لەزەت و خۆشیی سەعاتێك ، خەم و خەفەتە تا بەرپابوونی قیامەت ..

وە هەموو قەرزێك ئەبێ بدرێتەوە ..

وە قەرزی ناموس هەر بە ناموس ئەدرێتەوە ..

وە پیاو کاتێ دەست درێژ ئەکا بۆ ناموسی خەڵکیی ، ئەوە ناموسی خۆی ئەبات .

وە ئەوانەی کەمێ شادمان ئەبن بە لەزەتی حەرام، ئەوانە زۆر ەگرین بە دەست ئەو تاوانانەوە کە پێی هەڵسان ، کاتێ شەرەف و ناموسیان ئەشکێت ..

وە ئەوانەی ناپاکیی ئەکەن لەگەڵ شەرەف و ئابڕووی خەڵکا ، ئەوانە پێش هەموو شتێ ناپاکیی لەگەڵ شەرەف و ابڕووی خۆیانا ئەکەن ..

بەڵام ئەوانە وا دەست درێژیی لە ناموسی خەڵکیی ئەکەن ، لە ناموسی خۆیان بێخەمن ، چونکە بێئاگان و دوایین کەسن لە زانینی دەنگ و باسیاندا ..
خۆ ئەوانە ئەگەر راستیی بزانن چیان لە خۆیان

کردووه و چیان به سەرهاتووه ، له شەرم و تەریقییدا
خۆیان لـه گرۆی ئادەمیی ئەشارنەوه ..

إِنَّ رَبَّكَ لَبِالْمِرْصَادِ ﴿١٤﴾ الفجر

پەروەردگار هەمیشه تۆڵه له ستەمکاران ئەسێنێ و
لـه هەمو دادپەروەرێك دادپەروەرتره ..

« فما كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ التوبة

بەڵێ خوا ستەمیان لێ ناکات ، بەڵام خۆیان بوون
، ستەمیان لـه خۆیان کـرد ..

( ٥ )

بەڵێ ، تەنها ئیسلام مایەی بەختیاریی و سەربەرزیی
ئادەمیزاده .
تەنها ئەم رێزی راستەقینەی پێشکەش ئەکا ..
تەنها ئەم ئابروو و ناموسی ئەپارێزێ ..
هەر کۆمەڵێکیش پشتی لێ هەڵ کـەن بێ ئابروو

ئەبن ، بێ ئابڕوو ، ئەگەرچی بە دەم لافی پاکیی لێ بدەن ..

بەڵێ ئەندامانی نەفامیی ئاگایان لە وەزعی خۆیان نیە و زۆر لەخۆیان رازیین ، نازانن چەندێ لە زۆنگاوی بێئابڕوویا چەقیون ..

وە هەر شارستانیەتێك لە سەر رەوشت و ئابڕوو بەرپا نەبێت ، مایەی ئاژاوە و پشێویی و نەحەسانەوەیە بۆ مرۆڤ .

تەنها سەرنجێکی ئەمڕۆی ئەوروپا بەسە بۆ دەرکەوتنی ئەم راستیە !! .

( ١ )

خەریکی بازرگانیی بوو ‥ زۆریش دەوڵەمەند نەبوو ‥ خەریکی کڕین و فرۆشتنی مانگا بوو ‥ لە عێراق وە یا لە تیرانەوە ئەیکڕین و بە خۆی و بەو پیاوانەوە کە لە گەڵیا ئیشیان ئەکرد قۆناغ بە قۆناغ ئەیان ‌ڕواستنەوە بەرەو سووریا و لوبنان ‥ جاری وایش ئەبوو ئەگەیشتە میسر ، تا لەوێ بیانفرۆشێ و بە نرخەکەیان قوماش و کەلوپەلی دروستکراوی تر بسێنێ و بیهێنێتەوە بۆ عیراق ‥

لە راستیدا پیاوێکی موسڵمان بوو ‥ لێ بڕابوو بۆ خواناسیی راستەقینە ‥ شەونوێژیی و رۆژووی سوننەتی بە جێ ئەهێنا ‥ دەستی یارمەتیی بۆ هەژاران درێژ ئەکرد ‥ هەموو ئەرکێکی سەرشانی ، بەرامبەر بە خوا و بەرامبەر بە خەڵکیی بە جوانترین شێوە جێبەجێ ئەکرد ‥ زۆر لە خوا ئەترسا ‥ دەست پاك و داوێن پاك بوو ‥ نموونەی موسڵمانی

راستەبینە بوو .. خۆی بە خاوەنی ماڵ و سامان نەئەزانیی .. بەڵکو هەموو دەست کورتێکی خزمی وە یا هاو ماڵ و ناسیاوی شارەکەی ، هەتا هەموو هەژار و بێنەوایەکیشی بە هاوبەشی سامانەکەی ئەزانی .. ئەم خەریکی بەخشینەوە بوو خواش لەوە زیاتری ئەڕژاند بە سەریا .. لە راستییدا لە ژیانێکی خۆش و بێگەردا ئەژیا ، چونکە شانازیی بەوەوە ئەکرد ئەو خۆی بە بەندەیەکی ملکەچی خوا بزانێ .. چونکە لە راستییدا ئەمە خۆشترین و بەرزترین ژیانە بۆ ئادەمیزادی خاوەن سەلیقە ..

بەڵام ئەوەی پێویستە بیزانین ، ژیان لەسەر یەك شێوە بەردەوام نابێت .. ساتێ بە خۆشیی و ساتێکیش بە ناخۆشیی .. هەموویشی تاقی کردنەوەی موسڵمانی تێدایە .. دیارە ئەگەر خۆشیی بێت هەر خەیرە چونکە سوپاسی خوا ئەکا ، وە ناخۆشییش بێت هەر خەیرە چونکە ئارام ئەگرێت .. کورتەکەی ژیانی موسڵمان هەمووی شادمانییە ..

بەندەی موسلمان خەریکی کاسپیی حەلالی خۆی و خواناسیی بوو .. تا ئەوە بوو لە یەکێ لە گەشتەکانیا بەفرێکی زۆر و زەبەندە باریی ، ئەمەش پێش جەنگی جیهانیی یەکەم .. بەفرەکە یەکجار زۆر بوو ، بە شێوەیەك رێگا و بانی بڕیی .. ئالف و خۆراك هاتە کزیی و دەست نەکەوتن .. ئەمیش مانگای زۆری کڕییبوون و رێگا نەبوو بیان با بۆ فرۆشتن و لە بەر بێخۆراکیش هەموویان مردن جگە لە چوار سەریان..

کاتێ ئەو پیاوانەی کە لە گەڵیا خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون دیيان گلۆڵەی بازرگانی موسڵمان کەوتە لێژیی و دەستکەوتەکەی جارانیان ـ وا دەر ئەکەوێ ـ لەمەو لا نەبێت ، پشتیان لێ هەڵ کرد و دەوریان چۆڵ کرد و ئەمیش مایەوە خۆی بە تاقی تەنیا .. هەروایە .. ئەوانەی بە بۆنەی تەماعی دنیاوە لە دەوری پیاو کۆ ئەبنەوە ، لە کاتی تەنگانە و بێدەستیدا هیچیان پێوە دیار نیە جگە لە بێوەفایی ...

لەگەڵ ئەم باردەدا هەو دامەزراو بوو .. ساڵەکە
ساڵی گرانیی بوو ، خەڵکیی خوا خوای بوو بکەوێتە
بەمار و لە مەرگی گرانیی و برسێتیی رزگاری بێت ..
بۆیە موسڵمان ناسایی ، دوای بەربوونی رێگا و بان ،
وای بە چاك زانیی بە زووترین کات هەوڵ بدا چی
قەرزی وا بە سەرەوە بیداتەوە .. ئەوە بوو بە خۆی
و بە چوار مانگاکەیەزە قۆناغ بە قۆناغ ئەڕۆیشت لەم
لاوە بۆ ئەو لا ، بەنیازی ئەودوە بگاتە شاری حەلەبی
سووریا ، تا ئەوێ چی قەرزی وا بە سەرەوە بەپێی
توانا بیداتەوە و داوای مۆڵەت بکا بۆ دواخستنی ئەودی
کە ئەمێنێت ، بۆ ساڵی داهاتوو ، چونکە ئەمساڵ
بازرگانییەکەی شکستی هێناوە ، بەشکوم ساڵی داهاتوو ،
دوای تەنگانە ، خوا خێر و خۆشیی بڕژێنێ بە سەریاناء..
قۆناغ بە قۆناغ ئەڕۆیشت هەتا تێوارەیەکیان
گەیشتە دێیەکی بچکۆلەی سەرەرێگای نێوان مووسڵ و
حەلەب .. تەقەی دا لە دەرگای ماڵێك .. خاوەن ماڵ
هاتە دەرەوە و ئەمیش تێی گەیاند خەڵکی ئەو شوێنە

نیـه و میوانـه ، جـا ئه‌گه‌ر پێیـان خۆشـه ، بـا ئـه‌و شه‌وه لـه خزمـه‌تیانا بێت و بۆ به‌یانیی لـێ ئـه‌دا بۆ دێیه‌کی تر ..

ئـه‌و رۆژه ئوتێـل نـه‌بوو تـا رێبـواران تیـایـا بحه‌وێنـه‌وه ، هه‌روه‌ها چێشتخانه نه‌بوو تـا نانی تیـا بخۆن .. تـا ئه‌و کاتـه موسڵمانی رێبـوار بۆی هه‌بوو له‌سه‌ری جیهانی ئیسلامیه‌وه لێ بدا بۆ ئه‌وسه‌ری بێ ئـه‌وه‌ی کـه‌سێ ده‌سـت بێنێتـه رێـگه‌ی ، وه یـا لـه سنوورێکا بوه‌ستێنرێت ، چونکه هێشـتا ئیمپریالیـزمی رۆژئـاوا خاکی ئیسلامی داگیر و به‌ش به‌ش نه‌کردبوو، به‌م شێوه‌ی که ئێستا سنووره ده‌ستکرده‌کان ئه‌بینین ..

هه‌ر موسڵمانێ رێبوار بوایه و شـه‌وی بـه سـه‌را بهاتایه ــ چ لـه شار و چ له دێدا ــ ته‌قـه‌ی ئـه‌دا لـه ده‌رگای ماڵێك و خاوه‌ن ماڵیش به شـانازیی و سـنگی فـراوان و شادمانییه‌وه ده‌رگای ماڵی ئه‌خسته سـه‌ر پشت بۆ میوانی خۆشـه‌ویست ، ئه‌و میوانـه‌ی ــ به پێی ئاینه‌که‌یـان ــ خـۆی رۆزیی خۆی وا به کۆڵیـه‌وه و

حوایش لــه خاوەن ماڵ خۆش ئەبێت ، وە ئەو میوانەی
کە لە ناو ئەو هەموو ماڵانەدا ماڵی ئەوانی هەڵ بژاردوە..
ئیتر ئەو ڕێبوارە ئەوشەوە ئەبووە ئەندامێکی ئەوخێزانەو
بەوپەڕی ڕێزەوە خزمەت ئەکرا و بە پێی توانا خۆراکی
پێشکەش ئەکرا و لەگەڵ خۆیانا ئەخەوت ..

دیارە ئەمەش تەنها لــە بــەر خوا و پــەیوەندیی
برایەتیی ..

بەڵێ .. خاوەن ماڵ کە میوانی لــە بەر دەرگادا بە
خۆی و چوار مانگاکەیەوە دیی بەخێرهاتنی لێ کـــرد
و بردیــە ماڵەوە و مانگاکانیشی کردە حەوشەوە و دەستی
کرد بەخزمەتکردنی میوان و ئاڵفدان بە مانگاکانی..

( ٢ )

خاوەنماڵ زۆر دەستکورت بوو .. هۆیشی هەر
ئەو ساڵە سەختە بوو کە ئەو هەموو بەفرە بۆ ماوەیەکی
زۆر باریی بوو ، کە ئەوە بوو مەڕ و ماڵاتەکەی قــڕی
کــرد بوو و کشت و کاڵەکەی زیانی پێ گەیی بوو ..
بۆیــە ئەمیش هیچی بــە دەستەوە نەمــا بوو .. گرانیش

هێشتا تارمایی ڕەشی چڵکنی لە بەر چاوی خەڵکا هەڵ نەکەنرابوو .. خەڵکی زۆر ئەترسا لەوە خراپتریان بێتە ڕێ ..

ئەو خێزانە ژن و مێردێ بوون کە کوڕێکی دە دوانزە ساڵان ، بەڵکو زیاتریان هەبوو.. خانووەکەشیان بریتیی بوو لە دوو ژوور : یەکێکیان بۆ خەوتنی خۆیان و ئەوی تریشیان بۆ کوڕەکەیان ..

ئەو ئێوارەیە دوای نان خواردن لە دەوری میوان کۆ بوونەوە و دەستیان کرد بە وت و وێژ تا بەشێك لە شەو تاری دوور و درێژی پێ بە سەر بەرن .. قسەیەك لێرە و یەکێ لەوێ هاتنە سەرباسی میوانەکەیان و دەنگ و باسی ، تا ئەویش باسی خۆی بۆ گێڕانەوە و خاوەنماڵ زانیی کە هەندێ پارەی پێیە ..

هەر چۆن بوو بەشێك لە شەو تێ پەڕیی و کاتی خەوتن هاتە بەرەوە .. خاوەنماڵ بە خۆی و خێزانەکەیەوە چوونە ژووری خۆیانەوە و میوانیشیان نادە ژووری کوڕەکەیان .. ئینجا لە گۆشەی لای

راستی ژووره‌که‌دا جێگه‌یان را خست بۆ کوڕه‌که‌یان و لـه گۆشه‌ی لای چه‌پیشا بۆ میوانه‌که‌یان ..

ئینجا له به‌ر ئه‌وه‌ی نه‌وه‌کو میوانه‌که شه‌رم بکا ، خاوه‌ن‌ماڵ پرسیاری لێ کرد بۆ هه‌رشتێ که پێویستی بێ .. جاکه‌بۆی ده‌ر که‌وت بۆ هیچ شتێ دا نه‌ماوه و هه‌تا ئاویشی وا به لاوه ، کوڕه‌که‌ی و میوانه‌که‌ی به‌جێ هێشتن تـا هه‌ر که‌سه له‌شوێنی خۆیا بخه‌وێ ..

خاوه‌ن‌ماڵ گه‌ڕایه‌وه لای خێزانه‌که‌ی و ویستی بۆ خۆی بخه‌وێ ، خێزانه‌که‌ی ده‌می هێنایه بنـا گوێی و وتی : فڵانه که‌س ! تا که‌ی ئێمه هه‌روا له هه‌ژاریی و ده‌ست‌کورتیدا بمێنینـه‌وه ؟ ئـه‌م میوانه ده‌وڵه‌مه‌نده ، ئێمه‌یش زۆر داماوین بۆ سامان و مانگاکانی .. بـه‌ره‌و گرانییه‌ك ئه‌ڕۆین هـه‌تـا ده‌وڵـه‌مه‌نده‌کانیش مه‌گـه‌ر به‌وپه‌ڕی ناڕه‌حه‌تییه‌وه بـه‌رگه‌ی بگرن وه بێ گومـان لـه برسانا ئه‌مرین .. ئه‌وه‌تـا هه‌ر ئێستا رۆژێ تێرین و رۆژێ برسیمانه ، ئـه‌ی ئه‌گـه‌ر گرانیی کـه‌وتـه دێ‌که‌مانه‌وه ئه‌بێ حاڵمان چی بێ ، لـه کاتێکا نه پاره‌و

سامانمان لایە ، وە نە خۆراك ؟ •

ئەمڕۆ هەلت بۆ هەڵ کەوتووە و جارێکی تر بۆت هەڵ ناکەوێتەوە •• هەڵسە بڕۆ پارەکە لە میوانەکە بسێنە و مانگاکانیشی بەرە ، هەتا ژیانی خۆمان و کوڕە تاقانەکەمان بپارێزیت ••

نەك هەر ئافرەت ، بەڵکو هەموو مرۆڤێك ، کە ترسی قیامەت لە دڵیا کەم بوویەوە و لە سزای پەروەردگار دەستی شۆردبی ، هەروا بیر ئەکاتەوە •• گەورەترین تاوانی بە لاوە بچووکە بە مەرجێ لە پێناوی بەرژەوەندیەکی خۆیدا بێت ••

مێردەکەی پێی وت :

میوانمانە ، چۆن ئەبێ ؟ چۆن ئەبێ پارە و مانگاکانی لێ بسێنم ؟!

پیاوە جوامێریەکی پێ مابوو ، بەڵام ئافرەتە ـ چونکە کەمتر لە خواناسیی گەیشتبوو ـ شەیتان چوو بووە بن کلێشی و تەماع چاوی کوێر کردبوو ، بە بێ دامان هاتە وەڵام و نەخشەی کێشا بۆ پیاوە تا بەشکوم

ناپاکیی بکات لەگەڵ میوانی غەریب و ئاوارە .. پێی وت :

« بێکوژە ! ئەوسا فڕێی ئەدەینە چاڵێکی نزیکی ئەم دۆڵەوە .. کێ پێی ئەزانێ ؟! کێ ؟ » ..

هەروا بە ئاسانیی .. بێکوژە !!

تەنها ئیمانە پاسەوانی خوێن و سامان و نامووسی ئادەمیزاد .. جا کە ئیمان نەما وەیا ئەوەندە کز بوو کە بەرگەی شاڵاوی وەسوەسەکانی شەیتان و تەماعی دنیای نەگرت ئەوسا پاسەوان نامێنێ و دنیا ئەبێتە پاشاگەردانیی و کەس لەخراپەدا درێغیی ناکات ..

ئینجا بەوپەڕی بێخەمییەوە وتی :

« کێ پێی ئەزانێ ؟ » ..

واتە : غەریبە و کەسی لێرە نیە و هیچ کەسێکی نازانێ ئەمشەو لێرە بووە و ئێمە فەوتاندوومانە !!

کەس نازانێ !

ئەوەی ناسیاوی ئەم بێ نازانێ !

ئەوەی بە تەنگیەوە بێ نازانێ !

مێرده کاری بـه لاوه نامەردیـه و لـەولاشـەوه ترسی بوسێتیی بێویژدان کـەم نیـه و ژنـەش وا لای پێهـەڵ چنیوه و بەچیـەوه خێرا خێرا هانـی ئـەدا و شەیتانیش ئاگر خۆش‌کەری باسەکەیه .. بێوچـان وتـەی ژنه به تام و مەزەوه ئەدا بە گوێیا :

راستەکا « ئافرەته خـەمخۆری خێزانـەکەیه .. گرانیەکی ئێجگار گەوره چاوەڕوان ئەکرێت . پیـاوی ئەوێ بتوانێ سەری خۆی و خێزانـەکەی دەرکات .. ئەمرۆ رۆژی منییـه .. میوان و وەفـا و جوامێریی کاتی خۆی ئەوێ ، ئێسـتە نـا .. کاتی هـەرزانیی !!

وەسوەسەی شـەیتان بووه کۆمـەکیی بۆ وتـه زاراوییەکانی ئافرەتەکه و پیاوه خەریك بوو شـل بێ ، خێرا ئافرەته لێی هاته گوفتار تا ئیتر دوو دڵیی بەس بێ و ئەو هەله له کیس نەدات ، وتی :

« ئـەوەی تۆ پێی هـەڵ ئـەسیت پێویسـته بۆ رزگارکردنمان لـه مردنێکی مسۆگەر ، وه پێویستیی و ناچاریش ڕێگای کاری حەرام و قەدەغه ئەدەن » !

سەرەنجام پیاوە بە تەواوەتیی شل بوو ••
وەسوەسەی شەیتان و چپەی ئافرەت لە بناوانیا و
تەماعی دنیا و مەترسیی لە ژیانی هەموویان بە جارێکا
پیاویان لە خشتە برد ، چونکە ئیمانەکەی ئەوەندە
نەبوو لەم تاقی کردنەوەیەدا دەرچێت ••
بەڵێ کەوتە شوێن ژنە و بڕیاری دا میوانی غەریبی
بێ کەسی خواناس بکوژێت تا تاڵانی بکات ••

( ٣ )

تا بڕیاری ژن و مێردە یەکلایی بوویەوە و
بڕیاری ناپاکیان دا ، دووبەشی شەو تێ پەڕیی و
سێیەکی مابوو •• دنیا کش و مات بوو •• بە بێ دەنگ
و وەنگ •• هەموو گیانداریك مات و بێدەنگ بوو ••
کاتی خەو و حەسانەوە و پشوودانی بوو•• چراکانی ئەو
سەردەمە ، کە بریتیی بوون لە قوتیلە و بە زەیت دا
ئەگیرسان ، کوژابوونەوە •• تەنها ژن و مێردە و
شەیتانی مامۆستایان خەویان لێ زڕا بوو •• نەگبەتیی

یەخەی گرتبوون •• بە تایبەتیی شەیتان ، دوا
شلبوونی پیاوەکە بۆ کوشتنی میوانەکەیان ، لـ
خۆشیدا دەستی ئەهێنا بە سەر دڵیا :
وا خەریکە چەند نەوەیەکی ئادەمی دوژمنم فر.
ئەدەم و لە بەزەیی خوا دووریان ئەخەمەوە ••
پیاوە خەوی زڕا •• لە سەر نوێنەکەی هەڵسا
خەنجەرەکەی دەرهێنا و بە هەسان تیژی کردەوە •
ئینجا بەرەو ژووری میوانەکە و کوڕەکەیان کەوتە ر
•• ژنەکەشی بە دوایەوە بوو هانی ئەدا ••
نەوەکو ویژدانی بزوێ و پەشیمان ببێتەوە ، ب
نەیەڵێ ••
نەوەکو شۆڵەی ئیمانەکەی گەش بێتەوە و لـ
سەر ئەزمی خراپکاریی سارد بێتەوە ، با نەیەڵێ ••
شەیتان بەمە زۆر دڵخۆش ئەبوو •• پیاوەکە
لە بەر ئەوەی میوانەکەیان بە خەبەر نەبێتەوە ، زۆر
سەرخۆ هەنگاوی ئەنا ، بێچرپە و بە نووکی پەنجە
پێی ئەچوو بە رێوە •• ئەسپایی دەرگای ژوورەکە

کردەوە ‥ ئەیزانیی میوانەکە وا لە گۆشەی لای چەپی زوورەکەدا خەوتووە ‥ بەرەو ئەوێ کەونە ڕێ ‥ زوورەکە تاریك بوو ، تەنها تارمایی نوێنەکانی دیار بوو ‥ دەستی بەیاندە لاشەی ‥ دەستی بەرە و زوور کردەوە بۆ لای ملی دەستی پێ گەیشت ‥

خوایە هاوار ‥

خوایە بەزەیت ‥

ستەمە ، ستەم ! ٠

لە پێناوی چیدا خوێنڕشتن ؟!

لە پێناوی تەماعدا ؟!

شوورەیە !

لە پێناوی ژیاندا ؟!

ژیان ئەوەندەی پێ ناوێ ‥

خوا رزق و ڕۆزیی ئەنێرێ ٠

جا با مەردانە شتێکیان لە میوانەکە داوا بکردایە‥

وە کە هەر دەستیان لە بەزەیی خوا شووریی بوو ، با داوای یارمەتیان لە موسڵمانی غەریب بکردایە ‥

بەڵام نا ، هەمووی وەسوەسەی شەیتانە وا زیان و گوزەران نەکرێتە بیانوو .. وا دەوڵەمەندیی و دەستڕۆیشتن نەگیرێتە پێش چاو ..

خوایە یارمەتیت !

موسڵمانی غەریب و ئاوارە بێکەسە خۆت کەسی بە ..

هەر خۆت خاوەنی بڕیاری ئەی پەروەردگاری مەزن ..

هەر خۆت خاوەنی دانایەتیت ..

جا بۆ ئەوەی بە خەبەر نەبێتەوە ، دەستی لە کارا بوو ، خێرا وەك مەڕ سەری بڕیی ..

ژنە لە دوورەوە وەستا بوو نەی ئەوێرا بێتە پێشەوە .. کە زانیی بە تەواویی سەری لە لاشەی جیا کردۆتەوە ، لێی هاتە پێشەوە تا یارمەتیی بدا و پێکەوە لاشەی بەناڕەوا سەربڕاو را کێشنە دەرەوە..

رایان کێشایە دەرەوە .. حەپەسان .. چیی ئەبینن .. نا .. وا نیە .. تۆبڵێی وا بێ ؟! سەیری

یەکتریان کرد •• حۆیەتی •• لاشەی میوانەکەیـــان نیـــە ! • لاسەی کوڕە تاقانەکەیانە !!

خوایە هەر خۆت خوایت ••

دەسەڵات هەر دەسەڵاتی خۆتـــە ••

مەگەر هەر خۆت نەخشە بکێشی ••

پیاوەکە هـەنـاســەیەکی ســاردی هەڵ کێشا •• ژنەکەش بە شوێنیا هەناسەیەکی ساردتری هەڵ کێشا•• دەستیان وشك بوون •• چاویان زاق بوون •• رەنگیان گۆڕا •• ئەژنۆیان وشك‌بوون •• دڵیان ئەهات بە یەکا•• هەردوو پێکەوە هاتن بە لادا و لە پاڵ لاشەی سەربڕاوا بێهۆش کەوتن ••

ژن و مێردە دەنگە دەنگێکیـان دروست کـرد •• هەرچەندە ویستیان بەبێ چرپە کارەکەیان ئەنجام بدەن •• ئەمەش بووە هۆی ئەوەی میوانەکەیان بەخەبەر بێتە لەولاوە دراوسێکانیش بەخەبەر هاتن •• سەیر ئەکەن کوڕی خاوەن‌ماڵ سەربڕاوە و دایك و باوکی کوڕەش لـە باڵیا بە بێهۆشیی لەسەر زەویەکە کەوتوون ••

میوانەکە لەگەڵ دراوسێکانا هەڵمەتیان دا و ناوی ساردیان هێنا بۆ ئەوەی دەم و چاوی ژن و مێردەی پێ فێنك بکەنەوە ..

دوای ئاورپشێنێکی زۆر هاتنەوە هۆش .. کە چاویان کردەوە دەستیان کردەوە بە شین .. بە گریان .. بەڵام چۆن گریانێك .. بەکوڵ ئەگریان .. ئینجا داوایان کرد لە دراوسێکان تا هەواڵ بکەیەنن بە پۆلیس. ئەوەندەی پێ نەچوو پۆلیس بە پەلە هات و هەردوو تاوانبارەکەی گرت ..

خۆیان بە دەمی خۆیان دانیان نا بە تاوانەکەیانا.. دەریان بڕیی چ ناپاکییەکیان لێ وەشاوەتەوە .. دەریان بڕیی هیچ سۆزێکی ئادەمیانە لە دڵیانا نەما بوو کاتێ ویستیان میوانی خەوتوو بۆ تەماع سەر ببڕن ..

( ٤ )

ژن و مێردە ویستیان میوانەکەیان سەر بڕن ، کەچی میوانەکە رزگاری بوو و کوڕەکەی خۆیانیان سەر بڕیی ..

ئەمە چۆن بوو ؟

ئێوارە میوانەکە لە گۆشەی لای چەپی ژوورەکـە خەوتبوو ، خاوەنماڵیش هەر بۆ هەمان جێدا هـەڵمەتی برد .. ئەی چۆن کوڕەکەیان پێوە بوو ؟!

بەو شێوەیە پێوە بوو کـە خوا نـاپاکیی بـە لاوە ناپەسەندە ..

بەو شێوەیە پێوە بوو کـە خوا تۆڵـەی میـوانی خواناسی بێ تاوانی لێ سەندن ..

خوا خۆی هۆیەکان رام ئەکا تا ویستی بێتە دیی ، بێ ئەوەی کەس لە نهێنیی و دانایەتیەکانی تێ بگات .

دوای ئـەوەی خاوەنمـاڵ ئـەچێتە ژوورەکـەی خۆیەوە و کوڕەکەی و میوانەکەیان لە ژوورەکەیانا بـە جێ دێلێ ، کوڕە هەڵ ئەستێتەوە و بە شێوەی کوڕێکی دڵپاکی سنگ کراوە ئەچێتە سەر جێگای میوانەکەیـان کـە شێوە و هەنـدامی وا ئەگەیـەنن موسـڵمانێکی راستگۆیە بۆ ئەوەی زیاتر پێکەوە وت و وێژ بکەن ، چونکە وتەکانی میوانەکەیان بە تام و بڕ مانا و کاکڵە و

سوودبەخش بوون٠٠دەستیان کرد بە قسە و گێڕانەوەی بەسەرهات ٠٠ کوڕە باسەکانی زۆر بە دڵ بوون ٠٠ باس لە دوای باس درێژەی کێشا ٠٠ کوڕە خەو هێنای بە لادا و لەسەر نوێنی میوانەکە خەوت ٠٠

میوانی خواناسی خاوەن سۆز دڵی نەهات لاری خوێن گەرم بەخەبەر کاتەوە تا بچێتەوە سەر نوێنەکانی خۆی ، لە بەر ئەمە جوان دای پۆشی و شوێنەکەی خۆی بەجێ هێشت بۆ ئەو و خۆیشی چووە سەر جێگای کوڕەکە و خەوت ٠٠

کاتێ خاوەن ماڵ دێتە ژوورەکەوە ؛ لەبەر خۆیەوە لای مۆگەرە و شوێنی هەردووکیان ئەزانێ ، بۆیە راستەوخۆ ئەچێتە سەر کوڕەکەی و وا ئەزانێ ئەمە میوانەکەیە و لە جیاتیا کوڕەکەی سەر ئەبڕێ٠٠

بەڵێ ، لە کاتێکا ژن و مێردە خەریکی پلانی ناپاکیی بوون ، میوانی موسڵمان خۆشیی و کامەرانیی ئەخستە دڵ و دەروونی کوڕی خاوەن ماڵەوە ، بەو نیازەوە کە ئەمە تاقانەو خۆشەویستیانە و ئەوانیش

ئەمشەو ڕێزیان لەم گرتووە .. دیارە هەموو کەسێکیش بە پێی نیازی دڵی خۆی خوا لەگەڵیا ئەکات ..

ئەم سەربڕینەش لەو هەڵوێستە ئەکات کە یەکێ لە (خەواریج)ەکان پێی هەڵسا ، ئەوە بوو ویستی لە تاریکەی بەرەبەیانا عەمری کوڕی عاص بکوژێت ، کەچی لە جیاتیا خاریجەی کوڕی حوذافەی کوشت ، جا کە بە هەواڵەکەی زانیی ، پڕ بە دەمی خۆی هاواری کرد : « من عەمرم ویست و خوایش خاریجە » .

ئادەمیەکان نیازێ ئەکەن مەگەر خوا بۆیان بەجێ بکات ، خۆ ئەگەر ویستی خوا جۆرێکی تر بوو ، ئەنجامی هەموو نیازێ بۆشە ..

میوانی خواناس لەو تەڵەکەیە رزگاری بوو و دڵی خاوەنماڵی بەجێهێشت و بەرەو مەبەستی پیرۆزی خۆی کەوتە رێ .. لەولاوە دەر و دراوسێیش کوڕی سەربڕاویان ناشت و باوکیشی خرایە سووچێکی تاریکی بەندیخانەوە ..

لەدەستدانی کوڕی جگەرگۆشە ..

چەشتنی سزای بەندیخانە ..
سەرشۆڕیی و خەجاڵەتیی دنیا ..
تاوانی گەورەی قیامەت ..
هەموویان بە جارێ یەخەی پیاوەیان گرت ، کاتێ جڵەوی مێشك و ژیریی خۆی دایە دەست ژنێکی کەڕەعەوای تێنەگەیشتوو لە ژیان و لە نرخی ژیان و لە رەوشت و لە بەرهەمی رەوشت ..
دایکەش خۆی کردە پەند و ئامۆژگاریی بۆ هەموو افرەتێ کە بیەوێ کەڵك لە دەسەڵاتی خوا و سزای سەختی بەرامبەر بە ناپاکان وەر گرێت ..
خۆی کردە نیشانە تا هەموو کەسێ پەنجەی بۆ راکێشێ و هەموو سەیرکردنێکیشی هەر سزایەکی سەختی جەرگبڕ بێت .
ئیتر با ئەو خەم و خەفەتەی بوەستێ کە بە تەگبیری خۆی لاوی تاقانەی جگەر گۆشەی بەو ناسکیی و تەڕییەوە هاویشتە گۆڕی تەنگ و تاریکەوە ..
لە هەمووی گرنگتر وانەیەکی پیشانی هەموو

پیاوێك دا تا ئەگەر جوامێریان تیایە بـا خۆیان نەخشەی زیانیان بکێشن •• با تا خەمی قیامەت وەستا بێ خـەمی دنیـا نەخۆن ••

( ٥ )

لـە کاتێکا ئەم چیرۆکە بە سەر هەموو زمانێـکەوە بوو و خەڵـکیی بـە راسـتیی دەسـتی بەدەسـەڵاتی دادپەروەرانەی پەروەردگاریان ئەبینی ، دوو کۆتر بـە سـەر درەختێـکەوە ، بـە سـەر رووبـاری خاپووری فوراتەوە ، لـە نزیك قەرەقەیسـیاوە ، وت و وێژیـان ئەکرد •• پەند و ئامۆژگاریـان پێشکەش بـە ئادەمیزاد ئەکرد ••

یەکەمیان هاتـە گوفتار و وتی :

خوا هەر خۆی دەوڵەمەندە و خەڵکیی هەموویان هەژارن ••

وە خوا هەر خۆی رۆزیی‌دەری زانایە ••

وە رۆزیی خوا نووسراوە بۆ هەموو گیانداریك••

جا با هەموو کەسێ چاو بۆ رۆزیی حەلاڵ بخات ..

وە دووەمیان وتی :

پا ـ وان نیە وەك مەرگ بێت ..

وە خوا ـەر خۆی چاودێرە و لە ـت ئەپرسێتەوە ..

خۆ ئەگەر خەڵکیی خەوتن ، ئەوا خوای دروستکەر ناخەوێ ..

وە هیچ کەسێك نامرێت هەتا کاتی دیاریی کراوی مەرگی نەیەتەپێشەوە ..

یەکەمیان وتی :

فەرمانەکانی خوا بپارێزە ئەتپارێزێ ..

وە هەرکەسێ شەرم و ترسی خوای لە دڵا بێت ، دەرووی لێ ئەکاتەوە .

هەر دایك و باوکێك لەگەڵ خوادا راست بکەن خێر و خۆشیی ئەرژێ بەسەر جگەرگۆشەکانیانا .. .

وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا .. (٨٢) الكهف

وه هەر بەندەیەك لە كۆمەكیی و یارمەتیی برای موسڵمانیا بێت خوایش وا لە كۆمەكیی و یارمەتیی ئەوا..
وە دووەمیان وتی :

ستەم زۆر ناخایەنێ .. وە ئەگەر خایاندیشی تیاچوون بەشیەتی ..

وە داد زۆر ئەخایێنێ و هەتا دێت گەشە ئەكات..
وە ستەم تاریكایە ، وە هەندێ لە تاریكاییەكانی بەندیخانەكانن ..

وە داد رۆشنایە ، وە هەندێ لە رۆشنایەكانی ئاسودەیی ویژدان و دڵ و دەروونە ..

بەم شێوەیە هەموو بوونەوەر ئاهەنگێكی پڕ تام و بەلەزەتی گێڕا و هەموو دروستكراوەكانی خوا ـ بە گیاندار و بێ گیانەوە ـ سوپاسی پەروەردگاری خاوەن سۆز و داد و دەسەڵاتیان كرد .. بەڵام لەم ئاهەنگە گەورە بێ هاوتایەدا ـ بە داخەوە ـ ئادەمیزادەكان ، جگە

لـه کەمێکیان ، بەشداریيان نەکرد و هەموو بوونـە
کەڵك و پەندی وەرگرت ، جگە لەوانەی کـە ئاما
ئـاهەنـگەکە نەبوون •• بە راستیی هەر ئادەمیزادێ
خـوای پەروەردگار یاخیی بێ ستەمکار و نەفـامە
ستەمکارو نەفـامە •••

( ١ )

زۆرن ئەوانەی خوا بەخششیان بە سەرا ئەڕیژێ و دەوڵەمەندیان ئەکات ، لەوانەش هەیانە زۆر مەردانـە خوا لە خۆی رازیی ئەکات •• ئەزانێ لە رۆژی قیامەتـا نابێ لە شوێنی خۆیـا پێی بگوێزێتەوە هەتا پرسیاری لێ بکرێ لە بارەی سامانەکەیەوە چۆنی پەیدا کرد و بـە چیـا بەختی کرد •• بۆیە لـە هەموو کاسپیەکی حەرام خـۆی لا ئـەدا و زیریـی ئـەخاتـە کـار و جڵەوی دەروونی شـووم ئەگرێ ، تـا خۆشەویسنیی پـارە دڵی لـە خشتە نەباو نەبێتە کارەیەك شەیتان رازیی بکات •

حاجی ئیبراهیم موحەممەدیش کە لـە پەنجاکاندا لـە یەکێ لـە شارەکانی عیراقدا ئەژیـا ، یەکێ بوو لـە بازرگانە زۆر دەوڵـەمەندەکان و سامانەکـەی کردبووە خزمەتکاری ئاینـەکەی و بـە هەموو بارێکدا دەسـتی

یارمەتیی دریژ ئەکرد بۆ هەموو یەکێ کە پێویستیی بـە پارە بوایە ، وەهـا را هاتبوو دەسـت نـەنێ بـە رووی هیچ کەسـەوە و نـەهێلێ کەسـێك بـە دڵی شکستەوە بگەڕێتــەوە دوا ••

مەگەر ئەوانەی داماویی و پێویسـتیان کێشـا بێ بزانن چەندە کارێکی مەردانەیە موسڵمان بـە دەسـتی خاڵیی و دڵی شکستەوە نەگەڕێتــەوە و موشکوڵی گوشاد بێ •• چونکە ئەو کەسەی کـە دا نـەمێنێ ، یـا لێقەومانێکی دێت بـە سەرا ، تەنها ئەو ساتەی ژیـانی لـە بیرە و لە بەر چاوە •• جا کە داما بوو و کـەسـێ نەبوو دەست گرۆیی بکا ، ئەوا سەراپای ژیانی لەبەرچاو رەش ئەبێ و بە هیچ شێوەیەك هیوای بـە خۆی نامێنێ••

بۆیە وا ئیسلام یارمەتیی و دەست گرۆیی بە کارێکی زۆر چاکی ژماردووە •• جـا چیی هەیە ئیسلام نرخی خۆی نەدابێتێ ، لـە چاك و لە خراپ ؟

حاجی ئیبراهیم یەکێ بوو لـە دەست نەمامەکانی ئیسلام و خاوەنی دڵێـکی تەواو فراوان بوو •• ئەوە

بوو رۆژێکیان پیاوێك بــه ناوی « ۰۰۰۰۰۰ » ، وه هاته
لای که له دووکانه‌که‌یدا دانیشتبوو ، له « خان الشط »
کــه بــه سه‌ر رووبــاری دیجله‌دا ئــه‌ی‌نــواڕیی ۰۰
ســه‌رگوزه‌شته‌ی خۆی بۆگێڕایه‌وه ۰۰ به وردیی حاڵ
و ئه‌حواڵی خۆی خسته به‌رده‌م حاجی ئیبراهیــم و پێی
وت :

« من دراوسێتم ، وه کوڕه‌کــه‌م یــه‌کێ بوو لــه
هاوڕێ گیانی به گیانیه‌کانت ، وه لــه کاتی سه‌ره‌مه‌رگیا،
وه‌سیه‌تی بۆ کردم ئه‌گه‌ر هه‌ر گرێ‌کوێره‌یه‌ك هاته رێم
وه هه‌ر ناڕه‌حه‌تیی و ته‌نگانــه‌یه‌کی ژیانم هاتــه به‌رده‌م ،
په‌نــا بێنمه لای جه‌نابت ۰۰

« وه‌ك ئــه‌زانییت کشــت و کاڵی ئه‌مساڵ پاره‌ی
تۆوه‌که‌ی ده‌ر نه‌هێناوه‌تــه‌وه ، زه‌ویی وشك و ره‌ق و
بێ‌بارانیی هات بــه سه‌را و حاڵمان شپرزه بوو و نازانــم
چۆن چارێ بدۆزمه‌وه و به‌چی ته‌گبیری خۆم بکه‌م ۰۰

« وه له بانق پاره‌یه‌کم قه‌رزکــردووه و پێویســته

بیدەمەوە ئەگینا ئابڕووم ئەچێ و ناحەزانم دەست دێنن بەسەر دڵیانـا ..

« وا منیش ئەمڕۆ هاتوومەتـە لای جەنابت تا هەزار و پێنج‌صەد دینارم بدەیتێ بـە قـەرز تـا ئـەو پارەیەی بانقی رافیدەین کە قەرزە و لە گەردنمایە بیدەمەوە و تۆو بسێنم و تەگبیری خۆم بکەم .. وە بەڵێنت ئەدەمێ لـە وەرزی درەوی گـەنم و جۆی سـاڵی داهاتـوودا قـەرزەکەت بدەمەوە » .

حاجی ئیبراهیم لەوە و پێش ئەم پیاوەی نەدیبوو و نەی‌ئەناسی ، بەوەدا پیاوەکە بـە بۆنەی کوڕەکـەیەوە خۆی پێ ناساند .. وە تێ گەیشت ئەم پیـاوە زۆر لـێ قەوماوە ، بۆیە هەڵسایەوە و لـە قاسەکەیدا پارەکەی بۆ دەر هێنـا و بۆی ژمارد و دایـە دەستی و لە دەفتـەری حیساباتدا پارەکەی تۆمار کرد ..

کەسێ نەبوو لـە نێوانیاندا تـا لـە دواڕۆژا شاهێد بـێ ..

کابرا سوپاسی حاجی کرد و مەمنوونیەتی خـۆی

نزانند ، وه بەوپەڕی سووریيەوه دەری بڕی با
کۆپیالەيەك بنووسیّ و بە دەستی حاجیيەوه بێت ، بەڵام
حاجی ئەمەی نەویست و وتی :

« ئەرکی سەرشان سوپاسی ناوێت .. خوا لە
نێوانماندا بێت ، کە خۆی چاكترین پشت و پەنایە و
چاكترین شاهێد و ئاگادارە » .

دوای ساڵێك وە یان زیاتر حاجی ئیبراهیم بە هۆی
وەستانی دڵیەوە مرد و ژنەکەی و چوار منالی لە دوا
بەجێ ما کە گەورەترینی منالەکانی سیانزە ساڵان بوو..

( ۲ )

دوای تەواوبوونی تەعزیە و بەسەرچوونی
ماوەیەك ژنەکەی حاجی ئیبراهیم ، بە یارمەتیی برایەکی
پارێزەری ، کەوتە پشکنینی دەفتەر و تۆمارکراوەکانی
مێردەکەی تا مافی منالەکانی نەخورێ و فەرر و فۆڵەیان
نەفەوتێ ، بەمە هەرچی پارە و سامانێکی مێردەکەی بوو
بەلای خەڵکەوە هەمووی زانیی و بە زیزانە دەستی کرد

بـه وەرگرتنەوەی .. یەکێ لەو قەرزانە ئەو هـەزار و پێنج‌صەد دینارە بوو کـە حاجی ئیبراهیم بـە سـنەتێکی فراوانەوە لـە بەر رەزامەندیی خوا دای بە ( ..... ).

ژنەکەی پەلەی نەکرد تا چەند مانگێ بـە سەر مردنـی مێردەکەیا تێ پەڕین ، ئەوسـا ناردیـە لای و داوای قەرزەکەی لێ کرد ..

کابرای قـەرزار کەوتە ملبادان و دەری بڕی هیچ فـەرزێکی مێردی ئەوی بـە لاوە نیـە و ئـەوەی کە نووسراوە ، حاجی لە بیری چووە بی کوژێنێتەوە ، ئەگینا قەرزەکەی داوەتەوە پێی ..

ئەم دەنگ و باسە کەوتە گوێی خەڵکیی .. لـەوە و پێشیش هـەندێکیان بیستبوویان کـە حاجی ئیبراهیـم هەندێ پاردی بە قەرز داوە بە (.....) . ئەویش پێی راگەیاندن : بـەڵـێ قەرزار بووە ، بـەڵام قـەرزەکەی داوەتەوە ، خۆ ئەگەر قەرزار بووایە ئەوا کەس و کاری حاجی لـە ناو دەفتـەر و سجیلاتەکانیا کومپیالەیەك وە یـا هیچ نەبێ پارچە کاغەزێکیان ئەدۆزیەوە ..

دەر و دراوسێ هەر یەکە بە جۆرێ ئەم هەڵوێستەی لێك ئەدایەوە •• هەر یەکە بە گوێرەی ئارەزووی دەروونی قسەی ئەکرد :

هەندێکیان هاتنە سەر ئەو رایە کەوا کەس و کاری حاجی راست ئەکەن و پشت گیریان لێ ئەکردن ، وە ئەوەیان لە یاد بوو کەوا حاجی لە بەر رەزامەندیی خوا پارەی ئەدا بە قەرز بە خەڵکیی بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە نووسینێك وە یا سەنەدێك لە نێوانیاندا هەبێ •• بەڵام هەندێکیان بوونە پشت گیری ( ••••• ) کەوا عەقل وەری ناگرێ حاجی ئیبراهیم پارە بدا بە ( ••••• ) بە قەرز بە بێ سەنەد و کومپیالە •

کابرای قەرزار لە سەر ملبادانی خۆی سوور بوو •• زنەکەی حاجی ئیبراهیم ناچار بوو لە پیاوماقووڵانی گەڕەك داوا بکات بەشکوم تێی گەیەنن ، خوا هەڵ ناگرێ ، ماڵی هەتیوە ، بۆ ئەو ناشێ بیخوات ،

مالی کێ بۆ کێ حەلاڵە .. حاجی پیاوەنیی کردووە و لە تەنگانەدا فریای کەوتوە .. دەرو دراوسێ زۆر هاتن بە دەوری ( .... ) دا کەچی هیچ سوودی نەبوو.. دڵەکەی زۆر لە تاشەبەردی رەقی شاخەکان رەقتر بوو ..

( ٣ )

چار نەما ( .... ) بە هیچ کەس نەخووسا ، جا وەکو وتوویانە ، دوایین دەرمان سووتاندن و لە ئوتوودانە ، ئەوانیش ناچار بوون دادگا ئاگادار بکەن و گرێی نێوانیان بە دەستی ئەو بکەنەوە .

ژنەکەی حاجی ئیبراهیم برا پارێزەرەکەی کردە وەکیلی خۆی تا شکاتی حاڵی خۆی و لاریی بەرامبەرەکەی بگەیەنێتە دادگا .

رۆژی دیاریی کراوی دادگا هاتە بەردوە و تاوانبار ئامادەی مەحکەمە بوو .. گاڵتەی بە دنیا ئەهات .. دادگا چیە ؟ بە بێ بەڵگەو شاهید چیان پێ ئەکرێ ؟

خۆیان ماندوو ئەکەن .. کوڕە چاکتر ، با خەڵکیش ئیتر دەمیان بوەستێ لە باس و خواسم و بڵێن : حاکمیش لێی نەسەند ، کەواتە قەرزدار نیە .

ئادەمیزاد ئەگەر خوای لە بیر چۆوە ، ئای کە سەرسەخت و کەللە شەقە .. ئای کە لە خۆی باییە .. ئای کە هەموو کەسێ بە مێشوولە ئەزانێ ..

قوربان بەسەر .. بە خوا داماون .. بە تەمان کۆڵ بە من بدەن و قسەم بخەنە زەوییە .. خەیاڵی خاو ئەکەن .

حاکم پیاوێکی تێگەیشتوو بوو .. حاجی ئیبراهیمی چاك ئەناسی ، وە لە قوڵایی دڵیا بڕوای وا بوو حاجی ئەو پارەیەی دابێ بەو پیاوە و ئێستەش قەرزەکەی هەر بە لاوە بێ .. ئەیزانیی حاجی و ماڵ و منالی ناچن بە لای ساختە و گزیی کاریدا ..

بەڵام چی بکا قەزیەکە هیچ بەڵگەیەك وەیا سەنەدێك وەیا شاهێدێکی نیە جگە لەو تۆزە نووسینەی ناو دەفتەری قەرز و قۆڵەکەی کە ئەویش بەس نیە بۆ

سەلماندنی ..

ئینجا تاوانبار خۆیشی دانی بەوەدا ئەنا کە رۆژێك لە رۆژان ئەو هەزار و پێنجصەد دینارەی بە لای حاجی ئیبراهیمەوە قەرز کردووە ، بەڵام دوای سالێك پێی داوەتەوە و لە بیری چوە بی‌کوژێنێتەوە ..

وە شاهێدیش نەبوو جگە لە تاقە پیاوێك ، ئەویش تەنها ئەوەندی ئیفادە دا کە بە گوێی ( ..... ) ە وە بووە ستایشی حاجی ئیبراهیمی کردوە لەسەر ئەوەی لە پێناوی خوادا هەندێ قەرزی داوەتێ و بەو بۆنەوە لە هەژاریی و بێ‌دەستیی رزگاری بووە .. بەڵام ئیتر لە بیری نەبوو پارەکە چەندە و ئەو قسەیەی کەی لێ بیستووە .

لە راستیدا کیشەیەکی نادیار بوو .. لەو پەڕدیە ئەچوو کە کەوتبێتە بەر پلاری رەشەبا و بە ئارەزووی خۆی یاریی پێ بکا ..

حاکم زۆر حەزی ئەکرد بگاتە ئەنجامێکی دادپەروەرانە ، بۆیە هەوڵی ئەدا تاوانبار دان بنێ بە

راستیدا ، کەچی بۆ هەر پرسیارێ تەڵەکەیەکی بەکار
ئەهێنا و خۆی لـە وەڵامدانـەوە و روون کردنـەوەی
ئەدزیەوە .. کورتە کەی لەو پیاوانە نەبوو راستبی لێ
دەر بهێنرێ .. بۆیە حاکم ناچار بوو بە پێی : « البینـة
علی من ادعی ، والیمین علی من انکر » بجووڵێتـەوە ،
کە یـا ئەبێ کەس و کـاری حاجی ئیبراهیم شـاهێدی
رێك و پێك بێنن وە یا تاوانبار سوێند بـە قورئان بخوا
کـە ئەو قـەرزەی بـە لاوە نیـە ..

حاکم رووی کردە تاوانبار وپێی وت :

ئایا سوێند ئەخۆی بـە قورئانی پیرۆز کـەوا تۆ
ئـەو پارەیە و پارەی تری حاجی ئیبراهیم قـەرزارنیت و
هـەر قـەرزێکت بـە لاوە بوە پێت داوەتەوە ؟

وتی : بەڵێ .

حاکم ناچاری ئەوە بوو سوێندی تاوانبار بدات و
ئەویش بێ پەروا لە قورئانەکە چووە پێشەوە و سوێندی
خوارد ..

**چـۆن وێرای ؟**

جا بۆچ نەوێرێ ؟

ئەی قورئان فەرمانی نەداوە ماڵـی هـەتیو زەوت نەکرێ و ئەویش ئەم فەرمانەی پشت گوێ نەخستووە ؟

یەکێ لە قورئان ئەترسێ و بە ناڕەوا سوێندی پێ ناخوا مل کەچی فەرمانەکانی بێت ..

یەکێ لـە بەردەم قورئانا شەرم ئەکا ژیانی لـــە سـەر خواپەرستیی دا ڕێژا بێ ..

ئای چەند زۆرن ئەوانەی لە دەفتەر نفووسەکەیانا بـە موسـڵمان تۆمار کـراون ، کـەچی هیچ شـەرم و شۆیەك لـە قورئان ناکەن و هیچ ڕێزێـکی بۆ دا نانێن ، بەڵکو بگرە هەر رقیشیان لە قورئان و لە شوێن کەوتوانی قورئـانە ؟!

کە شاهێد نەبوو و تاوانباریش سوێندی خوارد ، دادگا ناچارە بـە بێ‌تاوانی دەر کا .. بەڵێ ، بە بێ‌تاوان دەر چوو !!

ڕەنـگی هاتەوە سـەر خـۆی .. هەناسـەیەکی حەسانەوەی دا .. بەرەو دوا گەڕایەوە و بـە سـەری

بـەرز و دڵی پڕ لە شادمانیی و فیز و دەمارێکەوە زووری
حاکمی بەجێ هێشت .. پێ کەوتوو بوو.. باڵابەرزێکی
لەش‌ساغی هەڵکەوتوو بوو .. ئەوەندەش تەمەنی بـە
سەر نەبرد بوو تا گەنجێتیی پشتی لێ هەڵ کا ..

هەر ئەوەندە بوو دادگای بە جێ هێشت لە گەڵ
ئەوانەدا کە هاتبوون لە گەڵیا ، گاڵە و دەنگە دەنگێـك
لـە دەرەوەی دادگا دروست بوو .. ئەوەندە دەنگـــە
دەنگەکە بەرز بوو حاکمیش لـە ژوورەکەی خۆیدا
هەڵسـا و هاتە دەرەوە بزانێ چی رووی دا ..

حاکم سەری سوڕ ئەما ..

چی ئەبینێ ؟!

بـە خۆی وت :

خۆ ئەمە تاوانباری سوێن‌خۆرە !

ساتێك لەمەو بـەر لە بەر دەمما بوو ..

لەش‌ساغ ..

گەنجێکی پێ کەوتوو ..

پیاوێکی رێك و پێك ..

ئەمە ئەوە وائێستە درێژ لەسەر زەویی ڕاکشاوە ؟
وا چاوی زاق بووە ؟
وا دەمی داچەقیوە ؟
وا ڕەنگی زەرد هەڵ گەڕاوە ؟
وا تەختی زەویی بووە و گیانی دەر چووە ؟
بەڵێ ، وەك درەختێـکی پیسی بێ کەڵك کە زەویی نەیگرێتـە خۆ و ریشکی ڕا گیر نەکا ، کەوتبوو ، هەڵ کێشرا بوو .. بێ گیان کەوتبوو ..
خوایە هەر خۆت خوایت ..
هەر خۆت دەسەڵات داری ..
ئەوانەی لە دەوریا وەستا بوون باش سـەرنجیان دا ، بۆیان دەرکەوت تەواو بووە ، گیانی دەرچووە .
قاڵی بڕایەوە ..
بەلام بە سووکیی و سەرشۆڕیی ..
خۆی لە قوولایی دڵیا ئەیزانیی بەناڕەوا پارەی ئەو هەتیوانە زەوت ئـەکا .. بـەلام چۆن ؟ بـە سـوێندی نـاڕەوا ..

قورئان فەرمایشتی پەروەردگارە .

کێ ئەتوانێ بە بێ ڕێز سەیریشی بکا ، چ جـەی سـوێند خواردن پێی بـە ناڕەوا ؟

زۆرمان دی لەوانەی بە بێ ڕێز ناوی قورئانیـــان ئەبرد و رقیان بوو لـە هەڵگرانیشی ، سـەرەنجام بـە رووی رەشەوە سەریان نایەوە .. ئەو دنیایەی کە بریتیە لـە دوو رۆژی مەینەتیی ، ئەو دنیایەشیان لەکیس چوو .. بە شێوەیەك لـە ناو چوون ببنـە پەند بۆ کەسانی تر تابزانن ئەمە تۆڵەی ئەوە بوو کە دژایەتیان لەگەڵ رێبازی قورئاندا کرد .. دژبە هەڵگرانی ئەجوولانەوە ..

( ٤ )

موسڵمانێك کە دراوسـێی حاجی ئیبراهیم بوو و ژنەکانیشیان بەخزمایەتیی بـە یەك ئەگەیشتن ، سـەر ئەدا لـە ماڵی حاجی تـا لـە ژنـەکەی ئـەم چیرۆکـە ببیستێ ..

ئەویش بـە وردیی بۆی گێڕایەوە . لـەپێشـەوە

هەڵوێستی حاجی ابراهیم بەرامبەر بە دراوسێکانی بە تایبەتیی و بەرامبەر بە خەڵکیی بە گشتیی .. کە هەمیشە پیشەی وا بووە پارەی داوە بە قەرز و تەنها لە دەفتەرێکی تایبەتیدا تۆماری کردووە و هیچی تر..

جا ئەیوت منیش هەموو جارێ لە سەر ئەوە لۆمەم ئەکرد و ئەویش ئەیوت: سامان سامانی خوایە، وە من ئەوسا هەژار بووم و خوا دەوڵەمەندی کردم، وە هەتیو بووم و دالدەی بۆ ناردم، بۆیە هەرگیز دڵی هیچ هەتیوێک ناشکێنم و دەست نانێم بە رووی هیچ داماوێکەوە .. وە هەموو جارێ کۆتایی ئەهێنا بە وتەکانی و ئەیوت.

« خۆزگە لە هەموو تەبریکا تەرزێکم ببوایە ..

ئەو ڕۆژەی کە دیاریی کرا بوو بۆ لێپرسینەوەی تاوانبار لە بەردەم دادگادا، ژنەکەی حاجی ئیبراهیمیش ئامادە بوو .. ئامادە بوو تا بزانێ هەڵوێستی تاوانباری سپڵەی بەدنمەک چۆنە بەرامبەر بە هەتیوەکانی حاجی ئیبراهیم .. ئامادە بوو تا بزانێ بڕیاری دادگا چۆنە .. چاک گوێی گرتبوو بۆ

پرسیارەکانی حاکم و ئیفادە لار و وێرەکانی تاوانبار ..
بە دڵێکی پڕ لە ئیمانەوە ئەیزانی پەروەردگاری مەزن
چاو و گوێی لێیە .. ئاگادارە .. دادپەروەرە .. مافی
کەسی بە لاوە نانەوتێ ..

شایەت نەبوو .. تاوانبار سوێندی خوارد ..
حاکمیش بە بێتاوان دەری کرد .. دادگای زەویی
چەندە دادپەروەر بێ لەوە زیاتری لێ نایە ..

کاتێ کە تاوانبار سوێندی خوارد مووچڕکەیەك
هات بە لاشەی ژنەکەی حاجی ئیبراهیمدا .. بڕوای
لە سەر ئەوە بوو بە درۆ سوێندەکەی خوارد ..
بێئەدەبیی کرد لە خزمەتی قورئانی پیرۆزا ..
خۆشویستنی ماددەش بەو ئەندازەیە ؟ چۆن مرۆڤێکە ؟
موسڵمان چۆن ئەوێرێ بە نیهادی پیسەوە روو بکاتە
خەڵاتی ئاسمان و بەرنامەی سەوزەویی ؟!

ژنەکە بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە لە کاری نەشیاوی
تاوانبار هەر لەژووری حاکمدا سەری بەرز کردەوە بۆ
ئاسمان و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ خوای بەدەسەڵاتدا :

حاکمی ئاسمانەکان و زەویی دا بمالێ .. وە ئـەو بە هەڵە ئەو زۆرانبازیەی لێك ئەدایەوە .. وای ئـەزانی لەگەڵ کـەس و کاری حاجی ئیبراهیمدا زۆران بـازیی ئەکا ، جا بە بەزاندنیان پارەکەی پێ ئەبڕێ و بێخـەم ئەیخـوا ، لـە بیری چوو بوو ئەمە بەرامبەر وەستانە لەگەڵ ئەو خوایەدا کە بە هیچ شێوەیەك چارەی ستەم و ناڕەوای ناوێ و هـەرگیز پیـاوی درۆزنی خـۆش نـاوێت :

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ﴿٣﴾ الزمر

چونکە موسڵمان هەموو شتێکی لێ بوەشێتەوە نابێ درۆی لـێ بوەشێتەوە ، بە تایبەتیی درۆیەکیش سوێند خواردن بێ بـە قورئانی پیرۆز !!

( ٥ )

لـە شەوێکی زیقەتی پڕ لـە سەرما و سـۆڵـەی زستانـا ، لە کاتێـکا کە باران بە خوڕەم ئەهاتە خوارەوە و ڕەشـەبا ئەیلووراند و هـەموو کەسـێ بـە توندیی

خوایە ، خۆت ئاگاداری هەموو ئاشکرا و نهێنیەکی
.. خۆت ئاگاداری غەیبی .. ئەگەر ( ..... )
درۆزنە و ئەم سوێنەی بە درۆ خوارد بە قورئانی
پیرۆز بیکەیتە پەندی بەرچاوی خەڵکی ، ئەی خوای
خاوەن هێزو دەسەڵات ..

کاتێ کە تاوانبار ئەیویست بە فیز و دەمارەکەیەوە
زووری حاکم بەجێ بێڵێ ، ژنەکە هەر تەماشای ئەکرد
.. سەیری تاوانباری ئەکرد .. سەیری بێویژدانی
ئەکرد . سەیری لەخوانەترسی ئەکرد .. تا ئەوە
بوو دوای چەند هەنگاوێك قورئانی پیرۆز کاری خۆی
کرد و تاوانباری دەستنیشان کرد .. بەڵام چۆن
دەست نیشانکردنێك .. بەو شێوەیەی ئەوانەی
دەوروبەری بەخێراترین کات بە چاوی خۆیان بیبینن
و هەزارەهای تریش بیبیستن ..

تاوانبار بەزمانی لووس و خۆشاردنەوە لە وەڵامی
پرسیارەکانی حاکم توانیی لە چنگی دادگای زەویی
رزگار بکا ، بەڵام نەیتوانیی خۆی لە چنگی دادگای

لیەکەی ەپێچا بە خۆیەوە و نەیئەزێرا ساتێ جێاکەی بەجێ بهێڵێ .. وە لە دەور و بەری نیوەشەودا ، زەنگی ماڵی حاجی ئیبراهیم لێ درا .. نە جارێك و نە دوان .. بە گەرمیی دا لیرابرویەوە ..

وە لە پشتی دەرگاکەوە ئافرەتێکی سەراپا رەشپۆش لەگەڵ کوڕێکیا کە تەمەنی شەش ساڵان بوو، وەستا بوو .. زنەکەی حاجی ئیبراهیم دەرگای کردەوە بزانێ کێیە وا تەقە لە دەرگا ئەدا ، سەیری کرد ژنی ( ...... ) ە و کوڕە تاقانەکەی وا لە گەڵیا ..

بە ژنەکەی حاجی ئیبراهیمی وت :

« مێردەکەم دانی نەنا بەوەدا کە ئەو قەرزاری حاجی ئیبراهیمە ، بەڵام من خۆم ئەزانم درۆزن بوو ، وە تکایشم لێ کرد کەچی قەرزی وا بە سەرەوە بیداتەوە ، وە چەند جار تکاکەم دووبارە کردەوە و زۆری لێ پاڕامەوە ، سوودی نەبوو و کەوتە شوێن هەوای کەللەی و ملی گومڕایی و سەرلێ شێواویی

گرتە بەر •• بەراستیی مێردەکەم ئەو درۆیەی چاك بژاردەوە •• وە زۆریش گران کەوت بۆی •• وە ئەوەش ئەو پارەیەیە کە قەرزاری مێردەکەت بوو » •

توورەکەیەکی هەڵ دا بۆ ژنەکە کە هەزار و پێنج‌صەد دیناری تیا بوو ، ئینجا بە پەلە بەشوێن خۆیا گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان و کوڕەکەشی بە شوێنیا •• ئەوەندە خێرا گەڕایەوە ، نەی هێشت ژنەکەی حاجی ئیبراهیم دوو لێوە بکاتەوە ••

ژنەکەی حاجی ئیبراهیم هەڵوێستەکەی بە لاوە زۆر سەیر بوو •• لە دەرگاکەدا وشك وەستا بوو •• سەیری دایك و فرزەندەکەی ئەکرد کە بەو بارانە و بەو تەڕ و تووشییە بە پەلە هەنگاویان ئەنا •• هەر سەیری ئەکردن تا بەرە بەرە چوون بە ناو تاریکییا و لە چاو ون بوون ••

ئەویش گەڕایەوە بۆ جێگاکەی خۆی •• بەبێ دەنگ ، بە بێ جربە •• خەوی لێ زڕا •• ئەوەی کە

تاقەتی بوو خوڕەی باران و لوورەی ڕەشەبای توند و تیژ بوو ..

## (٦)

موسڵمان کە لە هەڵویستی ( ..... ) ورد ئەبێتەوە سەری سوڕ ئەمێنێ :

چۆن ویژدانی هەڵی ئەگرت حاشا بکا لە قەرزی ئەو دەتیوانە لە کاتێکا تا حاجی ئیبراهیم خۆی مابوو بە تەما نەبوو حاشای لێ بکا ؟

دیارە لە بەر ئەوە نەبوە کە پارەی لە دەستا نیە ، چونکە ئەوەتا دوای مردنی ژنەکەی قەرزەکەی بۆ ئەداتەوە ..

ئەمە ئەوپەڕی بێئیمانیی و بێمتمانەیە .. ئەگینا خوا خۆی هەموو قەرزێك بار ئەکا ..

خوای گەورە زۆر بە رەحمە .. چاوی لە هەموو کەسێکە .. بەڵکو چاوی لە هەموو شتێکە .. چاوی لە مێرووولەیەکە لە ناو بەردێکی ناوەڕاستی

دەریای سوێردا •• رزق و رۆزیی ئەنێرێ بۆی ، بــە شێوەیەك كە بیری خۆیشی بۆی نەچێ !!

بەڵام چی ئەكەی لەوانەی چاویان زاف كردووە و بــە هیچێ لــەم دنیا بێوەفــایە تێر ناخۆن ؟ لــە جیاتی ئــەوەی كاسپیی حەڵاڵ بكرنــە بــەر و پشت بــە خوا ببەستن ، دەست ئەدەنــە ساختەكەریی و دەست بڕینی ئــەم و ئەو لــە ئەنجامیشا بــە سووكیی سەر ئەنێنەوە••

زۆر حەیفە بۆ ئادەمیزاد ـ كە خوا هۆش و ژیریی پێ بەخشیوە ـ شەرم و حەیای خۆی نەپارێزێ•• رێزی خۆی نەزانێ •• بۆ ماددە خۆی ریسوا بكات •• مــاڵ و سامانی خەڵك بخوا و بە ئازایەتیی بزانێ ••

ئەی لە جیاتی ئەوانە بۆچ داوای كۆمەكیی لە خوا نەكات ؟ بۆچ متمانە بە خوا نەكات و هــەموو بەخشش و لێهاتنێكی لەوەوە نەزانێت ؟

لــە مێژووی دوور و درێژی ئادەمیــزادا كێ بــە دەستبڕین و خراپكاریی بردوویەتیەوە ؟

چ پیاوخراپێك ڕەنگزەردیی دنیا و قیامەتی بە سەرا نەداتووە ؟

پێویست ناکا بۆ دنیا ئەوەندە ملکەچ بین ..
دەستخستنی دنیا بە حەرامیی سەرشۆڕیی وا بە شوێنەوە ..

لە جیاتی ئەوە وا چاکە ئیمانمان بە خوای پەروەردگار هەبێ و متمانەی پێ بکەین ، تا خوا کۆمەکمان بێت ، نەك تەنها قەرزمان بۆ بدانەوە ، بەڵکو سەربەرزیی دنیا و قیامەتمان دەست خات ..

ئەمەیە ڕێگای ڕاست .. ئەمەیە مایەی سەرفرازیی ..
چی ئەکەی : « ولكن اكثر الناس لا يعلمون » .

( ١ )

باران بە خوڕەم ئەهاتە خـوارەوە .. سەرزەمینێکی یەکجار تاریك بوو .. نیوەی شەو تێ پـەڕی بوو .. ئەرد بوو لـە جەرگەی حەوشەکەدا دەنگێـ هـات .. گریانی منالێـکی شیرەخۆرە بوو .. بـە دەنـگێـکی زولاڵـەوە ئەگریـا .. پەلـەقاژەی ئـەکرد .. دادی ئەکرد .. دیاربوو ماوەیـەك بارانی بـە خوڕەم لێی دا بوو .. بێشکە و جل و دۆشەکەکەی خووسا بوون .. ئەم منالە ساوایە بەم نیوەشەوە چیی ئەکا لـە حەوشەدا و لـە بەر باران و زوقمدا ؟

بە دەنگی منالەکە دایـکی بـە خـەبەر هات .. ژوورەکـە زۆر تاریـك بوو .. وایزانـی کۆرپـە شیرینەکەی وا لـە پالیـا ئەگرێ .. منالەکە ماوەیەك بێدەنگ بوو .. دەستی بـە ئەسپاییەکەوە درێژ کـرد بۆ لای بێشکەکەوە ، کەچی بەردەستی نەکەوت .. بە هەموو لایەکا دەولی دا دەستی بەری کەوێ و بزانـێ

جگەر گۆشەکەی بۆ ئەگری ، بەڵام بێ هوودە بوو ..
ناچار بوو مێردەکەی بەخەبەر کاتەوە تا ئەویش بزانێ
وا منداڵەکەیان نیە لەژوورەکەدا .. هەردووکیان
حەپەسان : چی بەسەر هات ؟ بۆ کوێ براوە .. لەم
سەرسەڕمانەدا بوون جارێکی تر گریەی منداڵەکە
کەوتەوە گوێیان .. باش وردی دەنگەکە بوونەوە
بۆیان دەرکەوت وا لە حەوشەکەدایە و بە هەناسە
بڕکێوە ئەگری ..

ئەم ژن و مێردە گەنج بوون و تەنها ئەو کۆرپەیان
هەبوو .. لەو حەوشەدا تاقە ژوورێکیان بە کرێ
گرتبوو و نیایا بەوپەڕی رێز و بەختیاریەوە ژیانیان
ئەدایە سەر .. پیاوەکە رۆژ تا ئێوارە کاری ئەکرد ..
زۆر خاوەن سەلیقە بوو .. خوای گەورە رۆزیی بە
سەرا رژاندبوو .. بەشی خۆی و خێزانەکەی ئەکرد و
لێشی ئەمایەوە .. ئەمەش لە بەر ئەوە بوو پیاوێکی
خواناس و رەوشتبەرز بوو .. کە ئێواران لە ئیش و
کار ئەگەڕایەوە ، بە روویەکی گەشاوەوە ئەچووە

ماڵـەوە و دوای کـەمێ پشـوودان و حەسـانـەوە و

خۆ تووڕپین بەرەو مزگەوت ئەکەوتە ڕێ تا بە دیمەنـە

پڕ ئەوشتەکانی مێشك و دڵ و دەروونی بحەسـێتەوە و

دەست بە فێنکیی بکات و لـە بـەر دەم پـەروەردگار

بحەسـێتەوە .. لـە مزگەوت ئەمایەوە تـا هـەردوو

نوێژی ئێوان و خەوتنان لەوێ بە کۆمەڵ بەجێ بێنێ و

یاد و ذیکری خوای پەروەردگار بکاو سوپاسی بێپایانی

بکا و لێشی بپاڕێتەوە تـا لـە گوناه و تاوانەکانی خۆش

بێت ، لـە لایەکی ترەوە تا چاوەکانی بـە بینینی براکانی

بڕەژێ و ڕوخەی بکات کە سەرانسەری ئـەرزەوپی

پڕیەتی لـەم جۆرە برایانە و قوتابخانـەکەی پێغەمبەری

خوا ـ صلى اللـه علیه وسلم ـ هـەزار سـاڵ زیاتـرە

سەربازی بـە وەفـا و پیـاوی خـواناسـی چاك پێگەیانـدووە و

پەروەردە ئەکات .. ئینجا دوای تێر کردنی گیان و دڵ

و دەروونی ئەگەڕایەوە ماڵـەوە تـا لەگەڵ هاوسـەری

دڵسۆز و بەوەفایـا نانی ئێوارە بخۆن و سوپاسی خـوا

بکەن لەسەر بەخششی ئیمان و رزق و ڕۆزیی حەڵاڵ..

ئینجا ئێواره زوو ئەخەوت تـا بەیانیی زوو لـە خـەو هەڵسێ و بچێ بە دەم کارو باریەوە ..

ئەو حەوشەیەی ئەوانی تیا ئەژیان خانوە شڕۆڵەی بێوەژنێ بوو کە مێردی مردبوو و ئەو خانوەی بۆ بەجێ هێشتبوو .. لەو مێردەی کوڕێکی هەبوو کە لە تەمەنی هەرزەکاریا بوو و هەرچی پێی بڵێی خـوو و ڕەوشت پیرەی نەلکا بوو .. ڕێگای شەیتانی گرتبووە بەر و بـە جارێ خواناسیی و کردەوەی چاکی نابووە ئەو لاوە ، یەکێ بوو لەو نەفامانەی کە باوەڕیان بە قیامەت نیـە و بـەو بۆنەشەوە لەچاك و خراپ و حـەلاڵ و حـەرام وشیاو و نەشیاو ناپرسنەوە . تەواو سەرگەردان بوو بـە شێوەیەك عەیبەو شوورەیی بـە لاوە نەبوو .. بە جارێ دەستی لـە خۆی بەر دا بوو ..

دایکی لـەبەر بێدەرامـەتیی ناچار بوو هـەندێ لەژوورەکانی بدا بـە کرێ بە چەند خێزانێك و تەنهـا ژوورێکی هێشتەوە بۆ خۆیان ، ژوورەکان زۆر ڕێك و پێك نەبوون ، بۆیـە چەند خێزانێـکی مام ناوەندیی بـە

کرێیان گرتن . لە پاڵ کرێی خانووەکەیدا هەر ئەسا بە پاك وخاوێن کردنی حەوشەکە و بە ناوی سازگار کووپەکانی بۆ پڕ ئەکردن تا شتێکی زیانی دەست کەوێ ، بەمە زیانی خۆی و کووپەکەی مسۆگەر کرد بوو .

بەڵام کرێکەی لە بەر بێ خاوەنیی و لە بەر ئەوەی کەسێك نەبوو ڕێگای ڕاستی پیشان بدا ، دەستی دایە گومڕایی و کردەوەی ناپەسەند ، تا سەرەنجام سەری لە مەیخانەوە دەرچوو .. وە هەرچی جارێ پارەی تەواو بوایە، یان بە پاڕانەوە پارەی لە دایکی ئەسەند ، وەیا بە دزە دەستی ئەگەیاندە پارەکەی دایکی و خۆی ئەگەیاندە هاوڕێ چەوتەکانی ..

یەکێ لە کرێ چییەکانیان ئەو خێزانە بوو کە سەرۆکەکەی پیاوێکی خواناس و پیاوچاك بوو .. جا لە بەر ئەوەی کاری ئەکرد و هێشتا خێزانێکی گەورەی نەکەوتبوو بە سەرا ، هەندێ پارەی پاشەکەوت کرد

بڕو ، تا بۆ دوا رۆژ کەڵکی لێ وەر بگرێ .. وە لە ناو ئەو سەرینەدا هەڵی گرتبوو کە شەوان ئەیخستە ژێر سەری ..

رۆژێ لە رۆژان مەنجی بەرەڵا خۆی لە خێزانی دراوسێ داکرت و کۆیی لە وت و وێژی نێوان ژن و مێردەکەوە بوو لەبارەی ژمارەی ئەو پارەوە کە لە ناو سەرینەکەدا دەیان رتووە ..

کە هەمەی بیست بڕیاری دا بە هەر شێوەیەك بووە ئەو پارەیە بخاتە دەستی خۆی و چەند رۆژێ پێی را بوێرێ ..

مرۆف کە بە پەروەردەی خواناسیی گەورە نەبوو بە تەمای لەوە خراپتریش بە لێی بوەشێتەوە ..

خەمیەتی خوای لێ برەنجێ ؟

خەمیەتی خەجالەتی دنیا و قیامەت بێ ؟

بۆ ئەم دنیا هەر زوو پەردەی شەرم و حەیای دڕاندەوە و باکی نیە هەرچی بێتە رێ و هەرچۆن باس بکرێ .. بۆ قیامەتیش بڕوای نیە ، رۆژێکی وەها

پڕ داد و یەکسانیی بێتە بەرەوە ..

ڕەنگە یەکێ بلێ :

دەردی نەخوێندەوارییە وا مرۆڤ لە تاڤی لاوییدا بیر لە دزیی بکاتەوە .

ئەوەی وابزانێ بەخوێندەواریی و وەرگرتنی زانیاریی ماددیی ، مرۆڤ پەروەردەی چاك وەرئەگرێ، بە هەڵەدا چووە ، لە پاڵ ئەوەدا تەواو بێئاگایە ..

چونکە ئەگەر وا بوایە ئەبوا هەرچی کاربەدەستی خوێندەوار هەیە ـ بە تایبەتیی گەورەکانیان ـ بە هیچ شێوەیەك نزیکی دزیی و ناپاکیی و بەرتیل‌خواردن نەکەوتنایەتەوە ..

جا ئەوەی تۆزێ سەرنجی دابێ ئەزانێ دز و دەستبڕ و جەردەی وڵات ئەوانەن .. هەژار و داماویش وا ئەزانن خزمەت ئەکەن ..

لەوانەشە بپرسن :

ئەی چار چییە ؟ وەی لە نەخوێندەواریی و وەیش لە خوێندەواریی ..

ئەڵێین : مرۆڤ بۆ زانین و زانیاریی دروست کراوە تا بتوانێ جێنشینێتیی خوا بکا لە سەر زەویدا ، بەڵام بە دڵ و مێشکێکی پڕ لە باوەڕەوە بە خوا و بە زیندوو بوونەوەی قیامەت .. تا ترس و شەرمی ئەو رۆژە لە خراپە بێ گێڕێتەوە و بەرە و چاکە بکەوێتە رێ ..

## ( ٢ )

هەرزەکاری نەفام بڕیاری دا بە هەر رێگایەك بووە پارەی ئەو خێزانە بەستەزمانە دەست خۆی بخات ، ئیتر بیری لەوە نەئەکردەوە ئەم خێزانە دراوسێیەتی و بۆی نیە هەرگیز زیانی پێ بگەیەنێ ..

وە بیری نەئەکردەوە ئەو کارە زۆر ناشیرینە و شیاوی شانی مرۆڤ نیە .. وە ئەگەر پێی هەڵسێ لە هەردوو جیهانا تۆڵەی لێ ئەسەنرێت .

بەڵام کە مرۆڤ ئاینی بە لاوە نەما ، دەستی لەرەوشت شۆڕیی ، ترسی خوا لە دڵیا نەما ، کەی

لەدزیی و جەردەیی سڵ نەکا ؟ کەی بە تەنگ خوێن و شەرەف و سامانی خەڵکەوە ئەبێت .. ئاواتە خوازە هەموو دنیا بکاتە قوربانی ئارەزووە شەیتانیەکانی ..

گەنجی بێویژدان وەك هەموو رۆژێك بەرەو مەیخانە کەوتە رێ تا هاوشانە رەوشت نزمەکانی بەسەر کاتەوە و چەند ساتێ لە گەڵیانا ژیانی تاوانباریی بداتە سەر ..

گەیشتە مەیخانە و لەگەڵ هاودڵی دۆزەخیا دەستیان کرد بە خواردنەوە.. یەکجار زۆری خواردەوە، بە رادەیەك تەواو مەستی کرد و دای لە کەللەی .. ئەوسا بە لارە و لەنجە لە نیوە شەوێکی درەنگا بەرەو ماڵەوە کەوتە رێ ..

بە هەر حاڵ گەیشتەوە ماڵەوە، بەرەو ژوورەکەی خۆی رۆیشت و چووە ژوورەوە .. ئینجا لەسەر قەرەوێلەکەی دانیشت .. هێشتا بەری نەدابوو .. پارەی ناوسەرینی ماڵە دراوسێکەی هاتەوە یاد .. دیارە دوای ئەوەی گیرفانی چۆڵ کرابوو و هیچ چارەیەکی تریشی نەبوو

بۆ پارە پەیداکردن .

باران زۆر بە خوڕەم ئەهاتە خوارەوە .. نە جێگەکەی خۆی هەسا و بە پێخاوسیی و بە دزە دزە کەوتە رێ .. سەرنجی دا دانیشتوانی حەوشەکە هەموویان خەوتوون .. دنیا کش و مات بوو .. هەموو خێزانێ بۆ خۆی دەرگای ژووری خۆی گرت بوو .. نات ئەوت کەسێکی تیایە .. دەنگ نەبوو جگە لە دەنگی خوڕەی بارانەکە .. ئەو بارانەی کە بە خوڕە خۆشیی و حەوانەوە پێشکەش بە دڵ ئەکا ، هەروەك بە چاوەوە بێت کە رەحمەتی لەگەڵا دێتە خوارێ ..

بەرەو ژووری دراوسێی خاوەنپارە کەوتە رێ..
دەستی دایە دەرگا ، دا نەخرا بوو .. ئۆخەی کەوتە دڵیەوە وەکو بڵێ : لە شانسی منایە وا ئەمشەو ئەم دەرگایە دا نەخراوە .. هەر ئەبێ بۆم بگا .. پاڵی نا بە دەرگاوە کرایەوە ، بەڵام کە دەرەوە ئەوەندە تارێك بێ چاو چاو نەبینێ ، دیارە ژوورەوە زیاتر ..

بیری کردەوە تا بزانێ بە چ شێوەیەك دەستی بگاتە پارەکە .

سەرینەکە وا لە ژێر سەری ژن و مێردەدا و ئەگەر دەستی بداتێ بەخەبەر دێن ..

کەوتە بیر کردنەوە ..

ماوەیەك لەژووری تاریکا وەستا ..

بە تەمابوو نەخشەیەك بکێشێ تابێی نەزانن ..

چۆن سەری ئەم ژن و مێردە لەسەر سەرینەکە لا چێت ؟

هەر ئەوەندەی زانیی شەیتانی مامۆستای هاتە خزمەتی و تەگبیری بۆ کرد .

تەگبیر کەوتە مێشکیەوە کەوا یەك رێگا هەیە بۆ ئەم کارە ..

ئەویش ئەوە بوو بێشکەی منالەکە بەرێتە دەرەوە بۆ ناو حەوشەکە و لەبەر باران دای بنێ تا دایك و باوکی بە دەم گریان و هاواریەوە را کەن و سەرینەکە بەجێ بێلن و ئەویش بەو تاریکە پری بداتێ و بی دزێ ..

بە بێدەنگ دەستی دایە بێشکەی منالی ساوا و بە بێ چرپە لە زوور بردیە دەرەوە و لە حەوشەکەدا دای نا •

منالی ساوای بێتاوانی خستە بەر باران •

ئینجا گەڕایەوە بۆ ناو زوورەکە و لە سووچێکدا خۆی داگرت و چاوەڕوان بوو زوور چۆل بکرێت و دەستی بگاتە سەرینەکە •

تاکە تاوانی پارەکە بوو •• وە تەنها ئەوەندەی لێ نەبێ ، ئیتر مەترسیی تیا نیە ••

ئیتر نەیئەزانی خاوەنی بوونەوەر ئاگای لێیە •• ستەم قبوول ناکا •• ساختە و گزیکاریی زۆر بە لاوە ناهەموارە و چاوپۆشییان لێ ناکا •

بوونەوەری لەسەر داد وەستاندووە •

نەی ئەزانی هێز هەیە چاودێریی هەنگاوەکانی بکا • کە سەیری ژن و مێردی خەوتوو و ساوای بێدەسەلاتی ئەکرد زۆر بە ئامانی ئەزانی دەستی بگاتە

ئەو پارەیە و لە رێی عەرەق و قومارا خەرجی کا .

مرۆڤ کە خوای لە بیر چوویەوە زۆر داماو و رەنجەرۆیە ..

نەکبەتیشی لەوەدایە خۆی بە ئازا و خاوەن مێشك و فێڵ و تەڵەکە ئەزانێ .

هەرچی کەسێ وەکو خۆی هەڵپەی ژیان و پەلەقاژەی چاوبرسییانە نەکا بە گێژی ئەزانێ .

ئەوە بوو ژنەکە و مێردەکەی هەڵسان و بە پەلە چوون بە هاواری منداڵەکەوە .

تا ئەوان رایان کردە دەرەوە و گەیشتنە لای منداڵەکەیان دزێش خۆی گەیاندە سەرین و پارەی ناوی .. پڕی دایێ و خستیە باوەشی و توند گوشیی بە خۆیا ..

خۆشەویستەکەم ! ماوەیەکە چاوەڕوانتم بۆ دەرەنگ هاتیتە باوەشم ؟

ماوەیەکە بە تەماتم بۆ دەرەنگ خۆت دا بە دەستەوە ؟

بەڵام هێشتا ترپەی دڵی ئەهات ..

تۆ بڵێی بچمە دەردەوە و پێم نەزانن ؟

تۆ بڵێی بە ئارەزووی خۆم پێی لێ را کێشم ؟

بەڵێ ، هێشتا تەواو دڵی بێخەم نەبوو بوو ..

خرا چەندەها کەسی کردبێتە پەندی زەمانە و لە سەر دزیی ئابڕووی بردبێ ؟

چەندەها کەس توانیێتیان رەواج بە خۆیان بدەن و زۆر بە زیرەیی خەریکی دزیی بووبن و هەوڵیان دابێ زیریی و سەلیقە بخەنە کار کەچی دەستی رەنگینی پەروەردگار ریسوای کردبن ؟

بەڵێ هێشتا سەرینەکە لە باوەشیا بوو و ئەیویست بە دوو سێ هەنگاو ژوورەکە بەجێ بێڵێ و رزگاری بێ ..

هێشتا ترپەی دڵی ئەهات نەوەکو پێی بزانن ، ترپەی ژوورەکە هات .

رزمەی سەربان هات ..

قرچەی دار و پردووی رزیو و تەپە و کرمــەی خۆڵی سەربان ، کە زوربــەی بــە بارانی خــوڕدم بوو بوە قــوڕ ، هات و هاتــە خوارەوە .. ســەربان بووە سەربازێك لە سەربازەکانی خوا تــا دزی دەروونلاری خوانەناس بکاتە پەند !!

سەربانی ژوورەکە بەتەنها هاتــەخوارەوە و بووە هۆی کوشتنی دزی ناپاك و سەرینی پڕ لە پارەش هــەر بــە باوەشیەوە بوو ..

هەروەها دزی خوانەناسیش بووە سەربازێك لــە سەربازەکانی خوا و خۆی کردە کوتەکی ناو چاکاو تاخێزانی خواناس رزگار بێت !!

نەخشەی بۆپارە کێشا تــا دەستی کەوێ ..

خوای گەورەش نەخشەی کێشا تــا منالی ســاوای بێ‌تاوان و دایك و باوکی ئیمان داری خواناس بــەدەستی ناپاك ، لەو چەند ساتە کەمەدا کە مابووی بۆ رووخانی ژوورەکە ، بێتە دەرەوە و رزگاریان بێت ..

وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ الأنفال

وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ... ﴿٤٣﴾ فاطر

لـه کۆتـایـیدا سوپاس و سـتایش بۆ خـــوای راگیرکەری بوونەوەر لە سەر داد و راستیی و هەزاران سەلامیش لـه سەر گیانی پاکی پێغـەمبەری پێشـەوای بانـگ کەر بۆ سەر رێبازی سەرفرازیی ..

# ناوەرۆك

# ئەم ناميلكەيە

● چوار چيرۆكى رووداوە كە پەندو ئامۆژگاريين بۆ خواپێداوان ، تا بە جوانيى بۆيان دەركەوێ و بە دڵ بڕوايان هەبێ خواى بەدەسەڵات بەستەم ـ ناپاكيى ئەرەنجێ و بە پێى پێويست هێزى ئەخاتە كار بۆ تۆڵە سەندن لە ستەمكاران و دەستدرێژيى كەران ..

● دەرى ئەخا بۆ هەڵگرانى قورئان خوا راستيى ئەوێ و تا ئەوانيش چاكتر دەست بە قورئانەوە بگرن چاكتر خواى گەورە كۆمەك و پشتيوانيانە ..

نرخى (٤٥٠) فلسە